




ژمارە ( 35) ساڵی ٢٠١٦

باس و توێژینەوە بڵاوکــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کــوردی دەربــڕی بیــر و بۆچوونــی توێژەرانــن نەک دەستەی نووســەرانی گۆڤار


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- پیتچنین: بەشی کۆمپیوتەر
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.
- تیراژ: ٥٠٠ دانە.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەكاتەوە.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناوونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨- ئەگەر ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باسەكە،

توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسەکە دانەیەکی لەسەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سەر کاغەز (A4) بە فۆنتی یۆنیکورد بێت، ناوونیشانی سەرەکی بە قەبارە (١٥) و ناوی توێژەر و ناوونیشانی لاوەکی بە قەبارە (١٤) و ناوەڕۆک بە (١٣) و پەراوێزیش بە (١٢) بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانیشەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و لە حاڵەتی ناچاریشدا تا (٣٠) لاپەڕە وەردەگیرێت، بە مەرجێ بۆ هەر لاپەڕەیەکی زیادە خاوەن بابەت بڕی (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینار بدات و پەراوێزەکانیشی لە ناوەڕۆک و لە پەراوێزدا لە ناو دووکەوانەی( ) بچوک دابێت و لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرابێت.

١١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی ناساندن و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بە هیچ شێوەیەک نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# سەروتار

وا بۆ دوو ساڵی ڕەبەق دەڕوات نیشتمان لەناو تەنگژەیـەکی گـەورەی دارایـی دەژیـت و ئەمـە لەگـەڵ خۆیـەوە کاریگـەری زۆر نـەرێنی لەسـەر سـەرجەم دام و دەزگاکان و زۆر بە تایبەتیش بەسەر دام و دەزگا فەرهەنگییـەکانی کوردسـتانەوە جێهێشتووە و نووزەی لە هەر هەموو دەزگاکان بڕیوە. تەنگـژەی دارایـی بـەدوای خۆیەوە شەڕی دڕندەترین تاقمی تیرۆریستی جیهانیی (داعش) ی بەدوا داهات و وا بۆ نزیکەی ساڵێك و نیو دەچـێت نیشـتمان لـەناو ئـاگر و جەنگدا لـە چـاوەڕوانیی سبـەینییێکی گەشـدا ڕۆژەکـانی خـۆی بـەڕێ دەکـات. کوردسـتان لـە ئێسـتادا بـە ناسـکترین و چارەنووسسـازترین چـرکەکانی خۆیـدا دەڕوات، هـەمووان چـاویان بڕیوەتە ئاسۆ و ئەوەی لە هەموو شت زیاتر مایەی شانازی گەلی کوردستانە، ئـەو یـەکگرتوویی و یـەکڕەنگیی هـەموو لایەنەکانـە لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی هێـزی تیرۆریستانی داعش. ئەمە لاپەڕەیەکی زێڕینە لە مێژووی گەلی کوردستان.

خوولی سـێیەمی ئـەکادیمیای کـوردی لـە (٢٠/٩/٢٠١٥) دروسـت لـەناو ئـەم چرکەسـاتە مێژووییـە زۆر ناسـکەدا هەڵبـژێردرا، دەسـتەی سـەرۆکایەتی تـازەی ئەکادیمیا ڕاستەوخۆ، یەکسەر کەوتە بن باری نزیکەی سی و پێـنج ملیـۆن دینـاری چاپخانە، کە (دەستەی سەرۆکایەتی پێشوو) بە قەرز کتێب و ژمارەکانی (گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی)یان پێ چاپ کردبوو، جگە لەوەش قەرزی نزیکـەی دوانـزە تـا پانزە ملیۆنێکی پاداشتی نووسەران و لێژنەکانیش، کە لـەوەتای مـانگی شـوباتی ساڵی ٢٠١٤ هەموو پاداشتێك ڕاگیرابوو، ئەویش کەوتۆتە سەر ئەکادیمیا. بۆیە هەر زوو دەستەی سەرۆکایەتی تازە ناچاربوو کتێب و چاپکردنی گۆڤارەکەی ڕابگرێـت بۆ ئەوەی بەو بڕە پارە (زۆر کەمەی)، کە مانگانە حکوومەت بۆی خـەرج دەکـات، بتوانێ کەمێك باری قەرزەکانی کۆنی سووك بکات و هەر لەبەر ئەمەشە لە کۆتـایی مانگی ئەیلوولی ساڵی پێشووەوە، کە هەڵبژاردنی دەستەی سـەرۆکایەتیی تـازەی تێدا ئەنجامدرا، لە یەك کتێب زیاتر چاپ نـەکراوە و ژمـارەی تـازەی گۆڤارەکـەش نەتوانرا لـە وادەی خۆیـدا بڵاوبێتـەوە. بـە لێکدانـەوەی ئـەم ڕەوشـەی کوردسـتان

پێیدا تێپەر دەبێت، دەستەی نووسەرانی تازەی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، کۆمەڵێك ڕێوشوێن و هەنگاوی تازەی گرتەبەر و کۆمەڵێك ڕێنوێنی تازەشی دەرکرد، کە لەگەڵ ئەم ژمارەیەدا بڵاوکراونەتەوە. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ڕەوشە داراییە، بڕیاردرا هەم ژمارەی لاپەڕەکانی گۆڤارەکە و هەم تیراژی گۆڤارەکەش کەم بکرێتەوە و سنووری بابەتەکانیش زۆر سنووردار بکرێن بەجۆرێك تەنیا ئەو بابەتانە بڵاوبکاتەوە، کە سەروساختیان لەگەڵ: زمان، مێژوو، ئەدەبیات و شارستانییەتی کوردەوە هەبێت و تا باری دارایی ئەکادیمیا ئاسایی دەبێتەوە، بابەتگەلی دیکە ڕێگە بە بڵاوکردنەوەیان نەدرێت. وا ژمارەی تازەی گۆڤارەکەمان جارێکی دیکە کەوتەوە بەردیدەی خوێندەواران و جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئەو تێبینییە بخەینە ڕوو، کە هەموو بابەتەکانی ئەم ژمارەیە لە لایەن دەستەی نووسەرانی تازەوە پەسند نەکراوە و ژمارەیەك لە وتارەکان لە لایەن دەستەی نووسەرانی خوولی پێشووەوە بڕیاری بڵاوکردنەوەیان لەسەر درابوو، تەنانەت هەڵەگری و نەخشەسازیش کرابوون، بۆیە ئێمە وەك ئیلتیزامێکی ئەخلاقی گەرچی بەگوێرەی ئەو ڕێبازە تازەیەی کە ئێمە بۆ گۆڤارەکەمان پەیڕەومان کردووە، تێبینیمان لەسەر هەندێك لە وتارەکان هەبوو، بەڵام هەر بڵاومان کردنەوە. بەو هیوایەی لە ژمارەی داهاتوودا گۆڤارەکەوە بتوانین بە تەواوی ئەو ڕێبازە نوێیە پەیڕەو بکەین، کە دەستەی نووسەران بۆ ڕەوشی ئێستا پەسنی کردوون و چاویشیمان بڕیوەتەوە ئەوەی ئیدی گۆڤارەکە بگەیەنینە ئەو ئاستەی، کە هەمووان بە تاسەوە پەرۆشن بۆ ئەوەی گۆڤارەکە بەڕاستی گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستی و شایانی دەزگایەکی بەرزی وەك ئەکادیمیای کوردی بێت.

# ناسینەوەی پیر شەهریاری هەورامان

**پ.د. زرار سدیق تۆفیق**
بەشی مێژوو – کۆلیجی ئەدەبیات– زانکۆی دهۆك

**دەستەوشەی سەرەکی: مێژووی کوردستان تەصەووف لە هەورامان و شارەزوور پیر شەهریار**

**١– دەستپێك:**

پیر شالیار یان پیر شەهریار، ناوێکی گەشاوە و ناسراوە و کەسایەتییەکی پیرۆز و پایەبڵندە لە مێژووی کلتووری کوردیی دەڤەری شارەزوور و هەورامان و یادگاری و بیرەوەریی فەرامۆش نەکراوە و لە خەیاڵدانی خەڵکی ناوچەکە بە زیندوویی ماوەتەوە و ساڵانە یادی دەکرێتەوە.

لەمێژەوە و لە نزیکەی نۆ سەدەوە، هەموو ساڵێك لە ناوەڕاستی وەرزی زستاندا، بەپێی ساڵنامەی نەورۆزی یان ساڵنامەی کوردی و لە دوا چوارشەممەی نیوەی یەکەمی مانگی بەهمەن کە بەرانبەری رۆژی پێنجی مانگی دوو– شوباتە، لە گوندی دەگاو هەورامان– دێی هەورامان، یان شارو هەورامان – شاری هەورامان، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو چیای کۆساڵان و داڵانی سەر بە شاری سەوڵاوە– سروە ئاباد، لە هەورامانی تەخت [1]، بە ئامادەبوونی هەزاران کەس لە دانیشتوانی باژێڕ و دێهاتەکانی هەورامان و ناوچەکانی دیی کوردستان، یادی پیر شەهریار دەکرێتەوە و بە زەماوەندی پیر شەهریار دەناسرێت و بۆ ماوەی دوو هەفتە بەردەوام دەبێت و چەندین رێوڕەسم لە خۆدەگرێت لە گوێزەبانەی لەدایکبوونی پیرشەهریار و بەخشینەوەی گوێز و دیاری و سەردانی ماڵی یەکدی و سەربڕینی دەیان ئاژەڵ و شایی و دیلان و هەڵپەڕکێ و گۆرانی وێڕای هەلقەی زیکر و دەهۆڵ لێدان و سەمای عیرفانی، بەڕێز رەووف مەحموودپوور، کە بەخۆی چەند جارێك لەم بۆنەیە بەشداری کردووە و لە نزیکەوە و بەچاوی خۆی وردەکارییەکانی ئەم جەژنەی بینیوە، لە دووتۆی کتێبێکدا بە درێژی لەسەر

بۆنەی زەماوەندی پـیر شـەهریاری دواوە[٢]، ئەمـەو سـەرەڕای گوتـار و نووسـینی دی[٣].

ئەوەی راستی بێت تـا نووکـە کـارێکی زانسـتیی قـووڵی وا نـەکراوە لـەپێناو ناسـینەوەی پـیر شـەهریار و دانـانی لـە جێگاوڕێگـای راسـت و دروسـتی خـۆی و دەرهێنانی لەنێو ئەو جیهانە پڕ لە ئەفسانە و چیرۆکە میللییەکان و رەواندنـەوەی ئەو تەمومژییەی وا دەورەی داوە [٤].

ئێمـە لـەم لێکۆڵینەوەیەمانـدا، لـە نـاوەڕۆکی زەماوەنـدی پیرشـەهریار و چـۆنیەتی راپەڕانـدنی برگـەکانی نـادوێین و نامانـەوێت زانیارییـەکان دووبـارە بکەینەوە، چونکە وێڕای ئەو کتێبەی ئاماژەی بۆ کـرا، لـە گـەلێك شـوێنی دی لـە گۆڤـار و رۆژنامـە و بەرنامـەی دوکیۆمێنتـاری و لـە ماڵپـەڕە ئەلیکترۆنێکانـدا باسکراوە[٥] .

لێکۆڵینەوەکەی ئێمە پتر مێژووییە و زیاتر هەوڵدەدەین ئاشـنایی لەگـەڵ پـیر شـەهریار پەیدابکـەین و لـەناو مێـژووی نووسـراودا بیدۆزینـەوە و بـە بەڵگـەی مێژوویی پشتڕاستی هـەبوونی بکـەین و بـە خوێنـەرانی بدەینـە ناسـین، هەرچـەند بەپێی هەندێك بۆچـوونی سـەرپێیی، پیرشـەهریار بـە کەسـایەتییەکی ئەفسـانەیی هـەژمارکراوە و گوایـە لـە واقیعـدا بـوونی نییـە، بـەڵام ئێمـە ئـەم بۆچـوونە رەتدەکەینەوە و کار بۆ ئەوە دەکەین کە بیسەلمێنین کەسایەتییەکی مێژووییـە و راستییەکی بۆ هەیە، بەڵام ئەوەی کارەکەی ئاڵۆزکردووە ئەوەیە کە ئەم پیـاوە هێژایە تەنیا لـە نێـو خـەڵکی هـەورامان و شـارەزوور بـە پـیر شـەهریار ناسـراوە، کەچـی لـە سەرچـاوە مێژووییـە عەرەبییەکانـدا بـە نـاو و ناسـناوی دیکـەوە ناسراوە[٦]، دیارە ئەمەش هۆکاری بنەڕەتییە بـۆ ئـەوەی کـە گومـان لـە هـەبوونی رێبەرێکی ئایینی پایەبڵندی کورد بکرێت .

### ٢- پیر شەهریار لە ئەدەبیاتی میللیی کوردیدا :

بەر لە هەموو شتێك دەبێت ئەوە بڵێین کە ناسـناوی راسـت و دروسـتی ئـەم کەسایەتییە لە ناو کوردی هەورامان پیرشەهریار بووە نەك پیرشالیار، کە بـەواتای شـای مـەزن، دەسـەڵاتداری گـەورە، ئـەو فەرمانڕەوایـەی کـە لەوانـەی هـاودەمی گـەورەتر و باڵادەسـتر بێـت دێـت، و شـەهریار لـە مێـژە لـەناو کـوردا بـاو بـووە و

فەقیهێکی کوردمان هەیە بە ناوی عەلی کوڕی شەهریار (م: ٨٠٥ك/١٤٠٢ز) کە مامۆستای ابن حجر العسقلانی بووە، هەروەها عبدالصمدی تـوداری کە لەساڵی ١٠٩٩ك/١٦٨٨ز کتێبی (نور الانوار)ی نووسیوە لەوێش هەر بە شەهریار ناوی دەهێنێت[7].

هەرچەند ئەو هەواڵ و دەنگوباسە میللییانەی کەوا دەماودەم لە باوانەوە گێڕاونەتەوە لەمەڕ ژیان و ناسنامەی پیر شەهریار، شێوە و روخسارێکی ئەفسانەئامێز هەڵدەگرن و ئاوێتەی رووداو و بەسەرهاتی نامێژوویی و نامەنتقی کراون، وەلێ هەندێك زانیاریی مێژوویی لەخۆدەگرن کە دەکرێت بکرێنە بنەما بۆ زیاتر گەڕان و سۆراخکردنی ئەم کەسایەتییە لە نێو سەرچاوە مێژووییەکاندا، بەپێی گێڕانەوەکان دەکرێ ئەم زانیارییانە دەست بخەین:

یەکەم: پیر شەهریار، ناوی محەممەدی کوڕی پیر محەممەد بووە و بە سەید مستەفاش ناوبراوە.

دووەم: هێشتا لەدایك نەبووبوو پیر محەممەدی باوکی مردووە و وەسێتی کردووە ئەگەر ژنە زگپڕەکەی کوڕێکی بوو ناوی بنێن محەممەد و چاودێری و سەرپەرشتی بکەن .

سێهەم : پیر شەهریار لە سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینی ژیاوە و تا کۆتایی ئەم سەدەیە لە ژیاندا ماوەتەوە.

چوارەم: هاودەمی شێخ عبدالقادری گەیلانی بووە (٤٧٠–٥٦١ك/١٠٧٧–١١٦٥ز) و شێخی گەیلانی ستایشی کردووە و بەبرای خۆی دایناوە فەرموویەتی : " أخي مصطفى انسان كامل "[8].

پێنجەم : شاە بەهار خاتوونی کچی شای بوخارا نەخۆشکەوتووە و چ حەکیم و نۆژدارێك هەبوونە نەیانتوانیوە چارەسەری بکەن تا پیرشەهریار توانیویێتی بەدوعا چارەسەری بکات و چاکی بکاتەوە، پاشان شای بوخارا ئەو کچەی پێبەخشیوە و لەمەوە بەناوی پیرشەهریار ناوبانگی بڵاوبووەتەوە .

شەشەم: هەروەها عبدالصمدی تـوداری دەڵێت پیرشەهریار سەیدی حوسێنیە و لە بنەماڵەی عورەیزیە و بە (العريضي الحسيني) ناوی بردووە.

حەوتــەم : پیرشــەهریار ســەرەتا موسـڵمانێکی پـێگیر نـەبووە، بـەڵام لـە خەونیدا پێغەمبەری بینیوە و تفی کردووەتە نێو دەمی، ئەمەیش بووەتـە مایـەی ئەوەی تۆبە بکات و بۆ بەیانییەکەی کە لە خەو هەڵدەسـتێت و بێـدار دەبێتـەوە و دەبێتە موسڵمان[9].

هەشــتەم : دانیشــتوانی هــەورامان هێشــتا لەســەر ئــایینی دێرینــی زەردەشتی بوون و کتێبێکی ئایینییـان هـەبوو بـەناوی مەعریفـەتی پیرشـەهریاری (یەکــەم و پــیر شــەهریاری (دووەم ) هــات و دەســتکاریی کتێبەکــەی کــرد و خەڵکەکەی هێنایە سەر ئایینی ئیسلام.

ئەگەر لەم زانیارییانە وردبینەوە کەوا سەدان ساڵە لەمەڕ پیرشەهریار لە ئارادایە، دەبیـنین هـەمووی تـا رادەیـەکی زۆر هـەمان زانیـارین کـە لـە سەرچـاوە مێژووییەکان تۆمـارکراون دەربـارەی کەڵەصـۆفیی کـورد تـاج العـارفین أبوالوفـا محەممەدی کوڕی پیر محەممەد، کە بە أبو الوفای حلوانی دەناسرا.

پیر شەهریار– ابـو الوفـا لـە ئـەدەبیاتی یارەسـانیش لـەیاد نـەکراوە و دەنگوباسی هەیە :

بابامیر و مستەفا
سەید محەممەد ئەبولوەفا
شێخ شەهابەددین حەبیبشاە
حاجی بابوسی عەلەمدارشاە[10].

### ٣– تاج العارفین أبوالوفا محەممەدی نەرگسی (٤١٧–٥٠١ك/١٠٢٥–١١٠٦ز):

تـاج العـارفین أبوالوفـا تـا ئـەم سـاڵانەی دوایـی زانیارییـەکی وردی لەسـەر نەدەزانرا و وەك صۆفییەکی ئاسایی باس دەکرا و تەنها لـەو کتێبانـەدا ناسـراوبوو کە دەربارەی ژیان و بەسەرهات و کەراماتی شێخ عبدالقادری گـەیلانی دانـراون و چاپ و بڵاوکراونەتەوە [11].

لەم کتێبانە بـەکورتی بـاس لـە ژیـانی تـاج العـارفین أبـو الوفـا و ژمارەیـەك صۆفیی دیـی کـورد کـراوە و ئامـاژە بـە گـەورەیی و پایـەداریی دراوە، بەوپێیـەی

یەکێك لەو کەڵە صۆفییانە بووە کە هاودەمی عبدالقادری گەیلانی بووە و دیدار و چاوپێکەوتن لە نێوانیاندا روویداوە و عبدالقادری گەیلانی ستایشی کردووە.

بێگومان تاج العارفین ابوالوفا کەسایەتییەکی هەرە ناوداری دنیای صۆفیگەری و یەکێك لە قوتبە دیارەکان و گەورە رێبەرانی قوتابخانەکانی رەوتەکە بوو لە سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینی و سەدەکانی دواتر و ناوودەنگی بە رۆژهەڵاتی ئیسلامی و بە تایبەت لە عێراق و کوردستان بڵاوبووەوە و لەم رووەوە هیچی لە شێخی گەیلانی و شێخ ئەحمەدی رفاعی (م:٥٧٨ك/١١٨٢ز) و صۆفیە رێبەرەکانی دی کەمتر نەبوو، بۆیە هەر لەو دەمەوە بەردەوام بایەخ بە ژیاننامەی دەدرا و کتێبگەلێك لەسەر ژیان و بەسەرهات و مەناقب و کەشف و کەراماتی دانران، لە هەمووشیان وەك لە ناونیشانەکانیەوە بەدی دەکرێت بە سەید و بە نەوەی زین العابدینی عەلیی کوڕی حوسێن دانراوە، لەوانە :

١- فخر آل زين العابدين بمناقب السيد تاج العارفين، لە نووسینی صۆفی ابن روزبة القلانسي (م :٦٣٣ك/١٢٣٥ز) [١٢].

٢- تذكرة المقتفين إثر أولي الصفا وتبصرة المهتدين لطريق السيد أبي الوفا، لە نووسینی شهاب الدين أبوالهدى محمد بن عبدالمنعم الشهير بالشربيسي الواسطي کە بەلای کەمەوە تا ساڵی ٧٧٧ك/١٣٧٥ز لە ژیاندا بووە .

٣- تتويج السادة الشرفا بمناقب السيد تاج الدين أبى الوفا .

٤- أنس المريدين الواصفين لمناقب السيد تاج العارفين .

٥- معين الراشفين فى مناقب السيد تاج العارفين .

٦- تتويج آل زين العابدين بسيرة السيد تاج العارفين .

٧- دليل ذوي الاصطفا من مناقب السيد أبى الوفا .

٨- الرسالة العزية.

٩- روضة أولي الصفا في مناقب السيد أبي الوفا .

١٠- هەروەها ابن السراج (م: پاش ٧١٥ك/١٣١٥ز) دەڵێت کتێبێك دەربارەی کەراماتی شێخ أبو الوفا دانراوە بێ ئەوەی ناوی نووسەرەکەی بهێنێت[١٣].

جگە لە دوو کتێبی یەکەم، لە راستیدا بۆمان یەکلایی نەبووەتەوە ئاخۆ کتێبەکانی دی ماون یان نا، وەلێ وادیارە مخابن لەنێوچوونە و هیچ هەواڵێکیان نییە و تەنانەت ناوی دانەرەکانیشیان نازانرێت و تەنها لە کتێبی (تذکرة المقتفین) ناویان براوە، خۆشبەختانە بە هاریکاریی برای بەڕێزمان دکتۆر سەروەر عبدالرحمن دانیشتووی بەرلین – ئەڵمانیا توانیمان دەستنووسێکی کۆپیکراوی ئەم کتێبە بەدەستبخەین کە لە کتێبخانەی گشتیی پاریس هەڵگیراوە و لەگەڵ رێزدار دکتۆر عیماد عبدالسلام رەووف ئەم کتێبەمان ساخ کردووەتەوە و ئامادەمان کردووە بۆ چاپکردن کە گەلێك زانیاریی نوێ و سوودبەخشی تێدایە، وەلێ هاوکات ئەوەش بلێین کە لە بەسەرهاتی ئەفسووناوی و هەواڵی هەڵبەستراو و چەواشەش بەدەر نییە، بەتایبەت سەبارەت بە بنەچە و نەژاد و موعجیزاتی ابو الوفا .

هەروەها کتێبی (فخر زین العابدین في مناقب سید تاج العارفین) ماوە و بە ئاگاداری ئێمە تەنها یەك دانەی دەستنووسی هەیە کە لە کتێبخانەی (الخالدیة) لە قودس پارێزراوە بە ژمارەی (١٠٠٦)، هەرچەند ئەم دانەیە لە مێژوویەکی درەنگ روونووس کراوە و دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١١١٨ك/١٧٠٦ز [١٤]، بەلاَم گومانم لەوە نییە کە پڕە لە زانیاریی نوێ و بەکەڵك و هەواڵی ناوازە لەمەڕ تاج العارفین ابو الوفا، بۆیە لە هەوڵی ئەوەدام بەدەستی بخەم و ساغی بکەمەوە.

أبوالوفا ناوی محەممەد و باوکیشی ناوی محەممەد بووە و لە ساڵی ٤١٧ك/١٠٢٥ز و پاش مردنی پیر محەممەدی باوکی، لە خاکی مرغا – مەرگە لە کوردستان هاتووەتە دنیاوە، هەر بۆیە ناوی ئەمیشیان ناوە محەممەد، دایکیشی کچی عومەری کوڕی شێرکۆی کوڕی أبو العمادی نەرگسییە کە لە ساڵی ٤٢٩ك/١٠٣٧ز مردووە و هەر لە مرغا – مەرگە و لە تەنیشت پیر محەممەدی مێردییەوە نێژراوە [١٥].

ئەوەی راستی بێت ئێمە بەتەواوی دڵنیانین مەبەست لەم مرغا – مەرگەیە کوێیە ؟ ئایا دەڤەری مەرگەی ئێستایە کە دەکەوێتە رۆژهەلاَتی رانیەوە یان شوێنێکی دییە، لەوانەشە مەبەست لە مەرگە هەر جێگەیەکی مێرگ بێت و مەبەست مێرگێکی شارەزوور یان هەورامان بێت .

بەپێی ئاخافتنی هەندێك سەرچاوە كە لەیەكدی وەریانگرتووە، ابو الوفا لە قوسان دوای مردنی باوكی لەدایكبووە، ئیسماعیل پاشای بابانی بەغدادی (م:١٢٩٩ك/١٩٢٠ز) دەڵێت سەید محەممەدی عەرەزی -العرضي- كە دەبێتە باوكی ابوالوفا لە ساڵی ٤١٧ك/١٠٢٥ز لە گوندی قوسان مردووە لە بەرزنجە لە وڵاتی كوردان [١٦]، كەچی لە سەرچاوەكانی دی مەبەست لەم قۆسانە دێهستانی قوسانە لە عێراق كە دەكەوێتە نێوان نوعمانیە و واست - كوتەوە و یاقوتی حەمەوی (م٦٢٦ك/١٢٢٩ز) ناساندوویەتی[١٧]، كەچی قوسان لای التادفی (م:٩٦٣ ك/ ١٥٥٦ز) بەشێوەی فوسان هاتووە [١٨]، فۆسانیش وا لێكدراوەتەوە كە بۆسانە و بۆسانیش بووەتە پۆشان - پۆشین كە گوندێكە لە نزیك نێرگسەجاڕ، نێرگسەجاڕیش بە زێدی ماڵباتی ابو الوفا دانراوە و گرێدراوە بەهۆزی نەرگسییەوە[١٩].

بەڵام ئەگەر ئێمە لەوە دڵنیابین كە باوكی و دایكی ابو الوفا لە دوای یەك لە ساڵانی ٤١٧ك/١٠٢٥ز و ٤٢٩ك/١٠٣٧ز لە مرغا - مەرگە مردوونە، بۆیە گومانمان لەوە نییە كە ابو الوفاش هەر لەوێ لەدایكبووە و تا پاش مردنی دایكیشی هەر لەوێ ماوەتەوە، تەنانەت دەمێك لە تەمەنی هەرزەكاری دەچێتە بەغدا و عەرەبی نەزانیوە، گوایە دوای ئەوەی پێغەمبەری لە خەوندا بینیوە و تفێكی كردووەتە ناو دەمی و لە ناكاوێكدا زمانی پرژاوە و بە عەرەبییەكی رەوان ئاخافتووە و گوتوویەتی " أمسيتُ عجمياً وأصبحت عربيا "[٢٠].

سەرچاوەكان دەڵێن سەید ابوالوفائی گەورە-واتا پیر محەممەد - باوكی تاج العارفين أبو الوفا لە ساڵی ٤١٧ك/١٠٢٥ز نەخۆشكەوتووە و مردووە، بێ ئەوەی هۆكاری مردنەكەی دیار بكەن، كەچی بە گوێرەی ئەو هەواڵانەی كە دەماودەم گێڕاونەتەوە، لە سەردەمی پیر محەممەددا ناوچەی هەورامان تووشی هێرشی هێزێكی بیانی بووە و داگیركراوە و خەڵكی هەورامانیش بڕیاریانداوە بەرگری لە خۆیان بكەن و ئەو هێزە بیانییە لە ناوچەكە دەربپەڕێنن، وا رێككەوتوون كە هەر ماڵێكیان كەسێك ئامادە بكات و هەموویان خۆیان ساز و ئامادە بكەن بۆ شەڕ.

پیر محەممەد یەکێك بووە لە ڕێبەر و پیاوماقووڵانی ناوچەکە و ڕێبەرایەتیانی کردووە و توانیویانە ئەو هێزە بیانییە بشکێنن و لە هەورامان دەریان بخەن پاشان بەهۆی خیانەتی یەکێکیانەوە ئەو هێزە بیانییە هێرشدەکەنەوە و پیر محەممەد بە دیل دەگرن و لە زیندانا دەمرێت، پێش مردنی وەسێتدەکات کە ژنە زگپڕەکەی ئەگەر منداڵی بوو ناوی بنێن محەممەد[٢١].

ئێمە هیچ بەدووری نازانین کە ئەم ڕووداوەی کەوا بەشێوەی زارەکی دەماودەم گێڕدراوەتەوە، هەمان ئەو ڕووداوانە بێت کە ابن الاثیر(م: ٦٣٠ك/١٢٣٢ز) لە ڕووداوەکانی ساڵی ٤١٧ك/١٠٢٥ز باسی دەکات- واتە ئەو ساڵەی وا بە کۆدەنگی مێژوونووسان پیر محەممەد یان أبو الوفای گەورەی باوکی پیرشەهریاری تێیدا مردووە-، لەم ساڵەدا علاء الدولە کوڕی کاکەوەیە لەگەڵ کوردانی گۆران نێوانیان تێکچووە و سەرکردایەتی گۆران بە دەستی بنەماڵەیەکەوە بووە بە ناوی بنەماڵەی بابۆنی یان بابۆیی و لە ئەنجامدا ئەبو فەرەجی بابۆنی کوژراوە، دواتریش کوردانی گۆران لە تۆڵەی ئەبو فەرەجدا ئەبو جەعفەری ئامۆزای علاء الدولە دەکوژن، پاشان علاء الدولە ناوچەکە دەگرێتەوە و هەموو بکوژانی ئەبو جەعفەری ئامۆزای دەکوژێت و ژمارەیەکیان بە دیل دەگرێت، دوور نییە پیر محەممەد یەکێك لەو کەسانە بووبێت بە کوشت چووبێت[٢٢].

بنەماڵەی ابو الوفا لە هۆزێکی کوردە بەناوی نەرگسی (النرجسیة)، ئەم هۆزەش کەوا دیارە لە هۆزەکانی شارەزوور بووە، مخابن تا ئەو دەمەی لە کوردستان بوو هیچ پێزانین و هەواڵێکی لەسەر نییە، پاشان لە کۆتایی سەدەی ٥ك/١١ز لەگەڵ چەند هۆزێکی دیکەی کوردا کۆچیانکرد بۆ عێراق و لە شاری حیللە و دەوروبەری نیشتەجێبوون، العماد الاصفهاني (م:٥٩٧ك/١٢٠٠ز) باسی ئەم هۆزەی کردووە و دەڵێت "بەشیری و نەرگسی دوو خێڵێکی کوردن نیشتەجێی حیللەن " و شاعیرێك بەناوی" الصارم مرجی بن بتاه البطائحي" دەڵێت :

وعشرون ألفاً أقطعت (نرجسية)      كثيرٌ لها ألف ولو أنّها بَعرُ

ولولا سُفاهُ الرأيِ كانَ عليهم      من الغَنَمِ الأعشارِ والصوفِ والشعرِ[٢٣]

تاج العارفین أبو الوفا یان محەممەدی نەرگسی، لە تافی لاویدا وەك پیشەیەکی باو لە کوردستان خەریکی کاری ڕێگری و چەتەیی بووە، پاشان لەسەر

دەستی صۆفییەکی دیکەی کورد، بەناوی ئەبومحەممەدی شەنبەکی[٢٤] تۆبەی کردووە و دەستبەرداری کاری ڕێگری بووە و بووەتە شاگردی شەنبەکی و دواتر شوێنی ئەوی گرتووەتەوە لە سەرکردایەتیکردنی ڕێبازەکەی تا بووەتە صۆفییەکی ناودار و لە گوندی قلمینیا ی سەربە دێهستانی قوسان دەگیرسێتەوە و دەیکاتە خەڵوەتگا .

سەرچاوەکان و کەسانی هاودەمی هیچ گومانیان لەوە نەبووە کە محەممەدی نێرگسی کورد بووە، بەڵام دوای ئەوەی بووە صۆفییەکی خوداناسی ناودار و خاوەند کەشف و کەرامات و پیاوچاکێکی بەرناس لە ناوچەکە، نەدەکرا بە کورد بهێڵرێتەوە و کوردبوونی بۆ پلە و پایەی دینداریی دەستینەدەدا و خەوشداری دەکرد و کەس قەناعەتی نەدەکرد کە تەرزە مرۆڤێك ئاوەها و وەلییەکی خاوەند مەقام لەنێو کۆچەرە کوردەکان سەرهەڵبدات و هەڵبکەوێت کە هەردەم لە لایەن ئەدەبیاتی ئیسلامییەوە بە جەردەیی و ڕێگری تاوانبار دەکرێن، بۆیە دوای پتر لە سەدەیەك پاش مردنی، لەلایەن ئەندامانی بنەماڵەکەیەوە لە برازاکانی و لەلایەن شاگرد و لایەنگرانیەوە لەساڵی ٦٠٨ك/١٢١١ز شەجەرەیەکیان بۆ هەڵبەستا و کردیان بە سەید و لە نەوەی عرض–عریضي کوڕی زین العابدین عەلیی کوڕی حوسێنی کوڕی عەلیی کوڕی ابو طالب و لە سەرجەم ئەو سەرچاوانەی وا لەسەری دواون وەك ڕاستییەك جێگیرکراوە[٢٥].

ئەگەر بێت و لە شەجەرەی باب و باپیرانی ابو الوفا بڕوانین، بەئاسانی بۆمان دەردەکەوێت کە هەڵبەستراوە و هیچ بنەمایەکی بۆ نییە، هەر بۆ نموونە پیر محەممەدی باوکی کە لە ساڵی ٤١٧ك/١٠٢٥ز مردووە کراوەتە هاودەم و هاوڕێی صۆفی (ذنون المصري ) کە وەك دیارە لە ساڵی ٢٨٣ك/٨٩٦ز مردووە.

ناوی دایکیشی بە فاتیمە یان بە أم کلسوم دانراوە[٢٦]، دیارە گومان لەوەشدا نییە کە ئەم دوو ناوەش هەردووکیان هەڵبەستراون و ناوی ڕاستەقینەی دایکی ابو الوفا نین و تەنها بۆ ئەوە دانراون تا وا بسەلمێندرێت کە ابو الوفا سەیدە و نەوەی ئیمام حوسێنە، وەك ئاشکرایە فاتیمە و أم کەلسوم دوو ناوی باوی نێو بنەماڵەی پێغەمبەرن .

دیارە و بەگوێرەی ئاخافتنی سەرچاوەکانیش ابو الوفا هیچ منداڵی نەبووە و دوای خۆی شاگرد و لایەنگران و هەروەها کوڕ و کوڕەزاکانی سالمی برایی جێگەیان گرتووەتەوە و درێژەیان بە تەریقەتەکەی داوە، بەڵام لە کوردستان چەند بنەماڵەیەك هەن خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ ابو الوفا، هەروەها گوایە خالید ئاغای کاژاویش خۆی بە نەوەی ابو الوفا داناوە و سەید موسای بەرزنجی کە لەساڵی ۷۰۸ك/۱۳۰۸ز دوای ڕاپەڕینێك بە دەستی مەغوڵ کوژراوە، کچی ئەم خالید ئاغایەی خواستووە، دوای کوژرانیشی سەید عیسای برای ئەم کچەی خواستووەتەوە و هەموو کوڕەکانی لەم کچەی خالید ئاغای کاژاوین.

پاش تەمەنێکی درێژ و پڕ بڕشت، سەرئەنجام تاج العارفین ابو الوفا لە ساڵی ٥٠١ك/١١٠٧ز لە خەڵوەتگاکەی خۆی لە گوندی قلمینیا مرد و هەر تێیدا نێژرا، دواتر گڵکۆ بۆ گۆڕەکەی ئاواکرا و بووە مەزار، لەو دەمەوە تا ئێستاش بە شوێنێکی پیرۆز سەیر دەکرێت و خەڵکی لەبەر پیرۆزییەکەی بەردەوام سەردانی دەکەن و دوعا و نزا و پاڕانەوە ئەنجام دەدەن.

### ٤- پلە و پایەی تاج العارفین ابو الوفا :

عبدالقادری گەیلانی ستایشی ابو الوفای کردووە و گوتوویەتی " لیس علی باب الحق کُردیٌ مثل ابوالوفا" [٢٧]، یەکێکی دیش بە شێخی هەرە مەزن (الشیخ الاکبر) دایدەنێت[٢٨]، هەروەها شێخانی تەریقەت لە عێراق سەرسام بوون بە مەزنی و پایەبەرزیی ابو الوفا [٢٩] .

بۆ زانینی پایەبڵندیی تاج العارفین ابو الوفا لەنێو هاوچەرخانی، وابزانم ئەوەندە بەسە ئەم بەیتەی شاعیر و عارفی ئێرانی حەکیم سنائی غەزنەوی (م:٥٢٩ك/١١٣١ز) یان (٥٤٥ك/١١٥٠ز) [٣٠] بکەینە بەڵگە:

قرنها باید کە تا أز مشت مدم نطفة

بو الوفای کُرد کردد یا شود ویس قرن[٣١] .

بەواتەی سەدەگەلێکی دەوێت تا نوتفەیەك لە پشتی ئادەمیزادێك ببێتە ابو الوفای کورد یان وەیسی قەرەنی .

بێگومـان کـوردانیش بەتایبـەت ئەنـدامانی هۆزەکـەی، لای خۆیانـەوە لـە رادەبەدەر تاج العارفین ابو الوفایـان خۆشدەویست و زۆر ڕێزیـان لێـدەگرت و بـە ڕێبـەری ئـایینی و پێشـەوای روحیـی خۆیـان دەزانـی و لـە کـاتی نەهامـەتی و تەنگانەدا هاواریان دەبردەبەر و دەردی دڵیان بـۆ هەڵدەڕشـت، بگـرە لـە ڕێـزی مرۆڤی ئاسایی بردیانە دەرەوە و وەك نیوچە خوداوەندێك لێیاندەڕوانی و بە کاکە – کاکیس ناویان دەبرد، کە بەهەڵە بە (أبـو الرجـال) لێکدراوەتـەوە [٣٢]، تـا ئـەو رادەیـەی کـە گـەلێك کـار و کـردەوەی ئەفسـانەییان دەخسـتە پـاڵ کـە عـەقل نایانبڕێت، گوایە هێشتا لە زگی دایکی بووە و کاتێك دایکی بـە یـاوەری ئەنـدامانی هۆزەکەی لە کۆچدابوونە و بەدەم ڕێگاوە بێستانێکی گندۆرەیان بینیـوە و دایکـی گندۆرەیەکی خواردووە و رشاوەتەوە، دواتر ابو الوفا بە دایکی گوتـووە ئـەوە مـن بووم کە ئەو دەمـەی لـە زگـت بـووم، نەمهێشـت گنـدۆرەی حـەرام بخـۆی و پێـتم تفانـدەوە هـەروەها، ئەنـدامانی هۆزەکـەی دەپاراسـت لـە دز و ڕێگـر و دەمێـك منداڵ بووە کە مانگی رەمەزان دەهات، شیری مەمکی دایکی نەخواردووە، گوایـە بەڕۆژوو بووە و ئەمجا خەڵکی زانیویانە کە مانگی رەمەزانە [٣٣].

نەك تەنها لە هەواڵە زارەکییەکانی هەورامان، بەڵکو لەو کتێبە مێژووییانەی کـەوا دەربـارەی ژیـان و بەسـەرهات و کـەراماتی نووسـراون، گـەلێك کـەرامات و مـوعجیزەی خراوەتـە پـاڵ و سـتایش و پیاهەڵـدانی بـۆ داتاشـراوە، ئەمـەش وایکردووە رۆژ بە رۆژ پایـەی بڵنـد بکرێتـەوە و شـتی ئەفسـانەی دیکـەی بخرێتـە پـاڵ، بۆیـە هـیچ سـەیر نییـە کـە ببیـنین بێـڕادە زیـادەڕۆیی لـە پلـە و مـەقامی کراوە [٣٤].

ابـو الوفـا تەمـەنی منـداڵی و هـەرزەکاری و گـەنجێتی هـەر لـە ئاواییـەکانی شـارەزوور و هـەورامان و لـەناو هۆزەکـەی بەسـەر دەبـات و ماوەیـەکی درێـژ لـە کوردسـتان سـەرقاڵی خوداناسـی و دینـداری بـووە و ڕێنـوێنی خـەڵکی سـادە و رەشـۆکیی دێهاتـەکانی کـردووە بـۆ کـاری چـاکە و خێرخـوازی و بۆیـە کاتێـك رووەدەکاتە بەغدا وشەیەك عەرەبی نازانێت و هەر بە زمانی کوردی دەدوێت [٣٥].

هەموو بەڵگە و نیشانەکان، چ لـە روایەتـە میللییـەکانی کـوردەواری و چ لـە هەواڵەکانی سەرچاوە مێژووییەکان، سەرجەمیان گەواهی دەدەن کـە ابـو الوفـا

واتا پیرشەهریار دەستکارییەکی جەوهەری بگرە گۆڕانکاییەکی ریشەیی لە هزر و بیرو باوەڕی جەماوەرەکەی کردووە و رۆڵێکی مەزن و بەرچاوی گێڕاوە لە رێنماییکردن و پێشەواییکردنی کوردانی شارەزوور و هەورامان و هێناویانێتی سەر رێگایەکی دیکەی خوداپەرستی و کردوونی بە موسڵمان و کە دەبێت ئەو دەمە موسڵمان نەبوو بووێتن (٣٦) .

بەپێی هەواڵێکی میللی کە دەماودەم باسکراوە و وەچە بۆ وەچە گێڕاویەتیەوە و وەك مامۆستا عبدالکریمی مودەریس دەڵێت وەك تەواتری لێ هاتووە، عبدالقادری گەیلانی لە تەمەنی تۆلاویدا لە ساڵی ٤٩٨ك/١١٠٤ ز (٣٧) لە رێگای چوونی لە گەیلانەوە بۆ بەغدا بە هەوراماندا گوزەری کردووە و لە رێگا لە گوندی نێرگسە جاڕ لایداوە و بووەتە میوانی سەید مستەفا (٣٨) –واتا ابو الوفا– و ماوەیەك ماوەتەوە و پشوویداوە و گوایە ماوەیەك لەو باخەی کەوا لە تەنیشتی دێی نەرگسەجاڕەوەیە دانیشتووە بۆ پشوودان و حەسانەوە پاڵیداوە بە دار پەڵکێکەوە کە بەسەر ئاوی باخەکەوەیە و گەلێك جار لەسەر ئەو بەردە پانە نوێژی کردووە کە لەسەر لێواری حەوزی مزگەوتەکە بووە(٣٩) .

کەچی شهاب الدینی واستی بۆ ئەوەی ابو الوفا لە کورد و کوردستان داببڕێت و سەیدبوونی بسەلمێنێت، دەڵێت شێخ عبدالقادر بە گەنجی چووەتە بەغدا و ویستوویەتی لە کۆڕی ئامۆژگارییەکانی ابو الوفا ئامادە ببێت، بەڵام ئەو رێگەی پێنەداوە و دوایی پاساوی بۆ هێناوەتەوە.

ئەویش لە بەرانبەردا زۆر کوردی خۆشدەویست و دەیگوت کوردان کاری وایان لە دەست دێت، کەسانی ژیر و هۆشمەند ئێرەییان پێ دەبات (٤٠)، ئەو وەك فریادڕەسێك بەهانایانەوە دەچوو و چ گرفت و ئاستەنگ و تەنگوچەڵەمەیەکیان هەبوایە، بەدەنگیانەوە دەهات و بۆی چارەسەر دەکردن، بۆ نموونە جارێکیان پردێك لە ناوچەکەیان رووخا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە کوردان نەتوانن هاتوچۆی ئەمبەرو ئەوبەری رووبارەکە بکەن، ئەویش بە کۆشش و کەرامەتی خۆی بە رۆژێك بۆی چاك کردنەوە(٤١) و هەردەم دوعای بۆ دەکردن تا پیت و بەرەکەت بکەوێتە ناو مەڕ و ماڵات و بەروبوومیانەوە، بۆیە هیچ سەیر نییە لەو رۆژەوەی کە هاتە گوندی هەورامانی تەخت و کچەکەی عەلی عەجەمی خواست، لەلایەن

خەزووریــەوە خــوان و ئاهــەنگێکی مــەزنی بــۆ ســازکرا و نــاوداران و زانایــان و پیاومــاقوولان بانگهێشــت کــران، دیــارە تــا هەنووکــەش هــەموو ســاڵێك یــادی لەدایکبوون و ئەم ژنخواستنەی ابو الوفا دەکرێتەوە(٤٢).

نـاوی کچـەکەش لـە هەواڵـە میللییەکانـدا شـابارەیە، کەچـی شـهاب الـدینی واسـتی بـۆ ئـەوەی سـەیدبوونی ابـو الوفـا بسـەلمێنێت و گرێـی بـدات بـە ماڵبـاتی پێغەمبەرەوە دەڵێت ناوی حوسنیە یان حوسینە بووە، هەروەك چۆن پێشتر ناوی دایکیشی کردە فاتیمە و أم کلسوم .

تەنانەت ابوالوفا بووبووە یەکێك لـە هێمـا و ناسـنامەکانی کـورد، ابـن عنبـە (م:٨٢٨ك/١٤٢٥ز) میللەتی کوردی بەوە ناسـاندووە کـە چـەند صـۆفییەکی تێیـدا هەڵکەوتووە، وەك شێخ عەدیی کوڕی موسافر و أبو الوفا و جاکیری کورد(٤٣).

لەلایەکی دیەوە ابو الوفا نزیکەی سەد مورید و شاگرد و دەروێشی هـەبوو کە دوای خۆی درێژەیان بە ڕێبازەکەی داوە و بڵاویانکردۆتـەوە، ئـەوەی بـۆ ئێمـە لێرە گرنگە ژمارەیەکیان هەر کورد بوون، وەك :

– ماجیدی کورد – ماجـد الکـردی. (م: ٥٦١ك/١١٦٥ز یـان ٥٦٤ك/١١٦٨ز)، صۆفییەکی ناسراوە .

- شهاب الدینی شارەزووری، شهاب الدینی واستی بـە "الشـیخ الأمـام العـالم القدوە " ناوی دەبات.

– ئەلیاسی کورد کە لەناو کورد بە پیر ئەلیاس دەناسرێت .

– ڕۆستەمی کورد کە ئەویش لە هـۆزی نەرگسـییە و بـاوکی صـۆفیی نـاودار محەممەدی کوڕی ڕۆستەمە کە بە شێخ جایگیر واتا جێگـر دەناسـرێت و لـە سـاڵی ٥٩٠ یان ٥٩١ك/١١٩٤–١١٩٥ز مردووە و لە گوندی ڕازان – الراذان لە نزیك سـامەڕا نێژراوە، ئەویش جێگایـەکی پـیرۆزە تـا لـەم ماوەیـەی دواییـدا چـەکدارانی داعـش گڵکۆکەیان تەقاندەوە .

– بزین کە بە شێخ بزین دەناسرا و ئێستاش وەك روونە شـێخ بزێنـی نـاوی هۆزێکی کوردە لەسەر ڕووباری زێی بچـووك لـە نێـوان پـردێ و تەقتـەق سـەر بـە پارێزگای کەرکووك و شوێنی دی نیشتەجێیە .

– ئیبراهیم سەمین کە گڵکۆی تا ئێستاش هەر ماوە لەنزیك قەرەتەپەیە، لەسەر رێگای کفری – جەلەولا .

– شێخ لەنگین یان شێخ لەنگەر– شێخ لەنگەر ئێستاش ناوی گوندێکە لە دەڤەری دوکان .

– شێخ باولین–شێخ باوە لەنێوان کەلار و جەلەولا .

بەکورتی ئەم دوو بەیتەی مەحویی شاعیریش (١٨٢٧–١٩٠٩) بەڵگەی روون و ئاشکران لەسەر پایەبڵندی و رێزداری خۆشویستنی تاج العارفین ابو الوفا لەنێو کورددا و گوزارشت دەکات لە لەیادنەکردنی و مانەوەی بەنەمری لە خەیاڵدان و ویژدانی توێژی زانایان و خوێندەواران :

کوردی زوبانی ئەصڵمە گەر تەرکی کەم بە کول

بۆ فارسی، بە کوللی ئەمن دەبمە بێ وەفا

دووری مەبینە تۆ لە کەریمی بەها نەجۆ

هەرچی کە کوردە پاکی ببەخشی بە(بوالوفا) [٤٤] .

**٥– ئەنجام: پیر شەهریار و أبو الوفا یەك کەسایەتین :**

١– ئەگەر بێت و لە ناوەڕۆکی کتێبی (تذکرة المقتفین ) وردبینەوە کە شهاب الدینی واستی لە ساڵی ٧٧٧ك/١٣٧٥ز نووسیویەتی [٤٥]، دەبینین ئەو زانیارییانەی لەنێو کوردەواریدا لەسەر پیر شەهریار هەن، هەمان ئەو زانیارییانەن کە لەم کتێبەدا لەسەر تاج العارفین ابو الوفا تۆمارکراون، هەر بە گوێرەی ئەم کتێبە ابو الوفا وەك باسکرا ناوی محەممەدی کوڕی محەممەدە، دوای مردنی باوکی لەدایکبووە، بەڕوونی و راشکاویش ئەوە راگەیاندراوە کە تاج العارفین أبو الوفا لەوێنەی پیر شەهریار سەیدی حوسێنیە و لە بنەماڵەی (العرضي) یان (العریضي) یە.

٢– ئەوەی زانراوە و مێژوونووسان دووپاتیان کردۆتەوە، تاکە صۆفیی کورد کە شێخ عبدالقادری گەیلانی ستایشی کردبێت ابو الوفایە، کاتێك گوتوویەتی: "لیس علی باب الحق كُردیٌ مثل ابوالوفا " وەك باسکرا[٤٦]، خەڵکی شارەزوور و هەورامان ستایشکردنی ابو الوفای رێبەر و پێشەوایان لەلایەن شێخی

گەیلانییـەوە لـەیاد نەچـووە و وەچـە بـۆ وەچـە دەمـاودەم گێڕوایەتـەوە، بـەڵام فۆرمەکەیان گۆڕیوە تا بووە بە " أخي مصطفى انسان كامل " [٤٧].

دەبینین بەلای عبدالصمدی توداری و خـەڵکی هـەورامانی تەختـەوەش، پـیر شـەهریار هـەر نـاوی سـەید مسـتەفایە و هـاودەمی شـێخ عبـدالقادری گـەیلانی بووە [٤٨].

٣- جارێکیان ابو الوفا لە گەشت و گەڕانی بانگخوازییدا دەگاتـە گونـدێکی خانـەدان، کـە دیـارە مەبەسـتی هـەورامانی تەختـە یـان شـارو هـەورامان و لـەوێ سەردارێکی گوندەکە میوانداری دەکات و داوای لێدەکات کـە رازی ببێـت کچـێکی بـداتێ و بیکاتـە زاوای خـۆی و نیـوەی باخەکـەی لەسـەر پاوەنـد دەکـات و ئـەم سەرداره بە گوێرەی ئاخافتنی شهاب الدینی واستی ناوی عەلی عەجەمیە [٤٩]، بەم بۆنەیەوە ئاهەنگی گەورە دەگێڕدرێت و خـواردنێکی زۆر ئامـادە دەکـات و دەیـان سەر مەڕ و ماڵات سەر دەبڕێت، هـیچ گومـان لـەوەدا نییـە کـە ئـەو ئاهەنگگێڕانـە مەزنە، بناغەی ئەم ئاهەنگگێڕانەی ئێستایە کە لە هەورامانی تەخت سازدەدرێت و بە زەماوەندو پیری دەناسرێت کە دیارە مەبەستی ئاهەنگ و زەماوەندی ژنهێنـانی پیرشەهریار بووە .

ئێمە دڵنیـاین لـەوەی کـە زەماوەنـدی پـیری لەمێـژەوە لـە کـات و شـوێنی دیاریکراوی خۆیدا واتا لە ناوەڕاستی وەرزی زسـتان و لـە هـەورامانی تـەخت یـان دەگاو هەورامان یاد دەکرایـەوە، عبدالصـمد تـوداری بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ باسی ئەمەی کردووە و دەڵێت سەید مستەفای ناودار بە پیری شەهریاری عـەریزی حوسینی (العريضي الحسـيني ) کـە هـاودەمی شـێخ عبـدالقادری گـەیلانی بـووە و نازناوی پێش الله یار بووە، وەلێ پاشان لە زمانی هەورامیدا بووە بە پیر شەهریار، لەمـەش گـرنگتر شـهاب الـدینی واسـتی دەڵێـت تـا ئێسـتاش -واتـا سـاڵی ٧٧٧ك/١٣٧٥ز مێژووی نووسینی کتێبەکەی - کوردەکان ابو الوفایان لەیادە و لە کاتی تەنگانە و پێویستیدا هاواری بۆ دەبەن و پەنای دەبەنەبەر [٥٠].

٤- لەلایەکی دییەوە واستی دەڵێت ئەو کوردانـەی کـەوا ابـو الوفایـان تێیـدا هەڵکەوتووە کوردێکی ناموسڵمان بوون و پابەند نەبوون بە نوێـژکردن و زەکاتـدان

و روکنەکانی دیکەی ئایینی ئیسلام و ابو الوفا بوو کە ئەمانی بە ئیسلام ئاشناکرد و کردنی بە موسڵمان و فێری روکنەکانی ئیسلامی کردن[٥١] .

لە هەواڵێکی دیکەی درێژدا هاتووە کە ابو الوفا لەمیانەی گەشت و گەرانی بانگخوازیدا رێگای دەکەوێتە گوندێك کە زۆربەی خەڵکەکەی گوایە خەوارج بوونە[٥٢] و گشت سەران و پیاوماقوولانی گوند هەر سەر بەو مەزهەبە بوونە – دەبێت مەبەستی شارەدێیەکی شارەزوور و هەورامان بێت، کوری یەکێکیان کە کوێخایەکی دەستەلاتدار و خاوەند رەعیەتێکی زۆر دەبێت پەنا بۆ ابو الوفا دێنێت کە باوکی چل ساڵە ئیفلیج بووە و ناتوانێت کارەکانی راپەرێنێت، ابو الوفاش دوعای چاکبوونەوەی بۆ دەکات بەو مەرجەی دەستبەرداری ئایینی خۆیان بن و بروا بە ئیسلام بهێنن، ئەویش لەسەر دەستی ابو الوفا قەناعەت دێنێت و خۆی و زۆربەی خەڵکەکە دەبنە موسڵمان و وەك لە هەواڵەکەدا هاتووە دەمودەست چاکدەبێتەوە، هەواڵی بەموسڵمانبوونی بە هەموو ناوچەکە بڵاودەبێتەوە و دەنگدەداتەوە، دانیشتوان سەریان لەم هەڵسوکەوتەی کوێخای ناوبراو سوردەمێنێ و لە هەموو لایەکەوە دەچنە کنی و نارازیبوونی خۆیان بۆ دەردەبرن و فشاری دەخەنەسەر و هەرەشەی کوشتنی لێدەکەن ئەگەر لە بەموسڵمانبوونی پاشگەزنەبێتەوە و پێی رادەگەهێنن : ابو الوفا راستە شەریفە–سەیدە، بەڵام لەنێو کوردانی نەزانی چۆلەوانی پەروەردە بووە و چوزانێت هۆکاری نەخۆشییەکەت چییە، خودا تۆی چارەسەر کردووە و پێویستە یەکسەر بگەرێیتەوە سەر ئایینی دێرینی باب و باپیرانت [٥٣].

ئەویش پاش چوار ساڵ لە بەموسڵمانبوونی ناچار پەشیمان دەبێتەوە و لەگەڵ خەڵکەکە دەگەرێنەوە سەر ئایینی رەسەنی خۆیان، کەچی راستەوخۆ ئیفلیج دەبێتەوە و وەکو پێشووتری لێدێتەوە، ئەمجا کورەکەی بۆ جاری دووەم داوای لێ دەکاتەوە کە دوعای دی بۆ بکاتەوە و چاکی بکاتەوە، ئەمجارە بە تەواوەتی دەبنە موسڵمان و پاشگەز نابنەوە [٥٤].

ئەم زانیارییانەی سەرەوە، بە جیاوازییەکی کەمەوە هاوشێوەیان هەیە لە هەواڵە زارەکییەکانی شارەزوور و هەورامان و پشتراستی یەکدی دەکەنەوە، پیرشەهریار بەم موعجیزەیەی سەرنجی خەڵکەکەی بۆلای راکێشاوە و قەناعەتی

پێهێنــاون بــەدەم داواکەیــەوە بــێن و ببنــە موســڵمان، واتــا دەســتکاریی کتــێبی مەعریفەتی کردووە و خەڵکەکەی کردووە بە موسڵمان و دیارە زیاتر لەبەر ئەم موعجیزەیەشی بووە خەڵکەکە بەیەکجاری بڕوای تەواویان بە توانـاو کـەراماتی هێناوە و وەك ڕێزلێنانێك بە پـیر شـەهریار ناویـانبردووە و کردوویانەتـە ڕێبـەر و پێشەوای مەزنی خۆیان.

دەکرێت چەند ڕاستییەکی دیکەی گرنگ لەم هەواڵە بەدەستبخەین :

– ابو الوفا بەخۆی لە کوردە گوندنشینەکانی دەڤـەری هـەورامان نـەبووە، بـەڵکو لـە کـوردە کۆچـەرە ڕەوەنـدەکانی شـارەزوور بـووە و نووسـەری (تـذکرة المقتفین)یش دەڵێت ابو الوفا لە خاکی مەرگە نەك گوندی مەرگە لـەدایکبووە[٥٥] و هۆزەکەشی ڕەوەندییە نەك جێگیر و گوندنشین.

– ڕەنگدانــەوەی کێشــە و نــاکۆکیی قــووڵ و بێبڕانــەوەی نێــوان کــوردی ڕەوەندی و کوردی گوندنشـین –گـۆران [٥٦]، ئـەوەتا خـەڵکی گوندەکـە سـەرەتا باوەڕیان بە موعجیزە و کەراماتی ابو الوفا نـەهێنا لەبـەر ئـەوەی هەرچـەند سـەید بووە لەنێو کوردانی نەزانی چۆلەوانی پەروەردە بووە .

– نزیکایەتییەك هەیە لەنێوان چاکبوونەوەی کوێخای گوند لەسـەر دەسـتی ابو الوفا و چاکبوونەوەی شاە بەهارخاتوون، کچە نەخۆشەکەی شـای بوخـارا لـە هەواڵە میللییەکان بەدەستی پیر شەهریار، هەرچەند جیاوازی هەیە لـە ناسـنامەی کەسـی چـارەکراو، بــەڵام لێکچــوونەکان زەقــترە و گرنگترینیــان ئەوەیــە کــە چــاکبوونەوەکە بــووە هۆکــاری ئــەوەی خــەڵکی ناوچــەکە ببنــە موســڵمان و بڵندبوونەوەی پلەوپایە و شکۆمەندیی ابو الوفا – پیر شەهریار لەنێو خەڵکەکە.

٥– هــەر دەربــارەی شــاە بــەهار خــاتوون، کــە هــیچ حــەکیم و نۆژدارێــك نـەیتوانیوە چارەسـەری بکـەن تـا پیرشـەهریار بـە دوعـا و پاڕانـەوە چارەسـەری کردووە و چاك بۆتەوە، پاشان شای بوخـارا ئـەو کچـەی پێبەخشـیوە، لـە کتێبـی (تذکرة المقتفین ) باسی شای بوخارا کراوە و هاتووە کە ابو الوفا بۆ خوێندن و فێربـوون چـووە بـۆ بوخـارا و شـاهی بوخـارا خـۆی لـێ نـەبان کـردووە و دڵـی شکاندووە، بۆ شەوەکەی شاهی بوخارا خەونێکی نـاخۆش دەبینێـت و لەخەونیـدا زۆر تێنووی دەبێت و ڕوو دەکاتە حەوزی کەوسەر بۆ ئاوخواردنەوە، پێغەمبـەریش

ڕێگای نادات و ناهێڵێت ئاو بخواتەوە و پێی دەڵێت بۆچی ابو الوفات ڕەنجاندووە کەپێی گوتووی من سەیدم و نەوەی پێغەمبەرم، کە لەخەونەکەی بێدار دەبێتەوە بەپەلە دەکەوێتە گەڕان بەدووی ابو الوفادا تا پاش ماوەیەك دەیدۆزێتەوە و تۆبە دەکات و دەبێتە موریـد و خزمەتکارێکی دڵسۆزی، لە چەند شوێنێکیش دەنگوباسی ژنێك هاتووە بەناوی (عەینا خاتوون) کە ئەویش لە موریـد و خزمەتکارە دیارەکان بووە و پەیوەندیی بە شاهی بوخاراشەوە هەبووە[٥٧].

لە ڕوایەیەکی دیدا هاتووە کە ئەبو محەممەدی شەنبەکی گوتوویەتی أبو الوفام لە ڕۆژی قیامەتدا بینی و کەژاوەکەی لە دە هەزار سوڵتان و هەزار عارف پێکدەهات و بە دەوریەوە دەخولانەوە و لەناویاندا دوو ژن هەبوون، یەکێکیان حوسنیەی هاوژینی بوو و ئەوەی دیشیان عەینا خاتوون بوو[٥٨].

٦- سەرەڕای ئەمانە، بەڵگە و نیشانە مادییەکانیش سەلمێنەری ئەو ڕاستیەن کە پیر شەهریار و تاج العارفین ابو الوفا یەك کەسایەتین، ئەو پردە رووخاوەی وا أبو الوفا بۆ کوردەکانی نوژەنکردەوە و بە پردی صیرات چواندی[٥٩]، تا ئێستاش شوێنەواری لەسەر رووباری ڕۆخانە-سیروان لە دەڤەری هەجیجی هەورامان هەر ماوە لەنێوان هەردوو گوندی کەلەمەمیو و کاسکە ئەرخەوان و بەپردی صیرات دەچوێندرێت[٦٠]، ئەو باخەی کەوا عەلی عەجەمی پێشکەشی ابو الوفای کرد و تا ئێستاش لە هەورامانی تەخت هەر ماوە و بە باخی پیری دەناسرێت و ئەندامانی هۆزی گزریاوە لە ڕۆژی هەینی و پێش دەستپێکردنی زەماوەندی پیر لە ڕۆژی چوارشەممە هەڵدەستن بە دابەشکردنی گوێزی دارەکانی باخی پیر و بەشێوەیەکی یەکسان بە سەر خەڵکیدا، وەك ئاگادارییەك و مژدەیەك بۆ نزیکبوونەوەی دەستپێکردنی یادکردنەوەی زەماوەندی پیرشەهریار[٦١]، نێزیکییەکیش بەرچاو دەکەوێت لەنێوان هۆزی گزریاوی و هۆزەکەی ابو الوفا واتا نەرگسی .

لەلایەکی دییەوە، چ لەم کتێبە و چ لە هەواڵە میللییەکان جەخت لەسەر ئەوە کراوە کە ابو الوفا- پیرشەهریار دوای ئەوەی پێغەمبەری لە خەو بینیوە و تۆبەی کردووە و بووە بە موسڵمانێکی پابەند .

لە میانەی ئەم بەراوردکردنەدا، دەکرێ بلێین پیرشەهریاری هـەورامان و ابـو الوفا یەك کەسن و پیرشەهریار کە بە خۆی نـاوی محەممـەد بـووە لـە بـەر ئـەوەی راستەوخۆ گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتووە لـە کـوردێکی ڕێگـر و چـەتەوە بووەتـە مرۆڤێکی موسڵمان و پاشتریش صۆفییەکی ناودار و یـەکێك لـە هـەرە ناسـراوترین صۆفییەکانی عێراق و کوردستان، بۆیە لەلای خـەڵکی هـەورامان و شـارەزوور بـە پیر شەهریار ناسراوە، واتا شای مەزن و گەورەی شار، واتـای ئـەم نازنـاوەش زۆر نزیکە لە هەردوو نازناوی (أبو الرجال) و ( الشیخ الاکبر)، واتا شێخی هـەرە مـەزن کە لە سەرچاوەکان هاتوون .

محەممـەدی نەرگسـی دوای ئـەوەی چـووەتە بەغـدا و تێکـەڵ بـە بزاڤـی صۆفیگەری بووە، لەوێ نازناوی دیکەی پێ بەخشـراوە، وەك (ابـو الوفـا )و (تـاج العارفین )، گوایە ئەم نازناوەی دووەم ئەبو محەممەدی شەنبەکی پێی بەخشیوە.

**پەراوێزەکان:**

(١) بەڕێز نامیق هەورامی بەسوپاسەوە دەستنیشانی جێگاکەی بۆکردم .

(٢) جەژنێك بۆ پیر و بنەمایەك بۆ ئیستوورەی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری (هەولێر: ٢٠٠٩) .

(٣) له مێژەوه زانیومه که محمد بهاء الدین صاحب کتێبێکی بەناوونیشانی پیر شالیار داناوە، بەڵام دەستم نەکەوت و نازانم چۆن باسیکردووە، حەمە کەریم هەورامیش پیر شالیاری کردووەتە ناوەڕۆکی رۆمانێك . پیر شالیار، وەزارەتی رۆشنبیری (سلێمانی : ٢٠٠٤).

(٤) سەبارەت بەو را و بۆچوونانەی دەربارەی سەردەمی زیندەگیی پیر شەهریار هەن، بڕوانە: ئەیووب رۆستەم، هەورامان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی – کولتووری، چ٢، (سلێمانی:٢٠٠٨)،ل٢١٠–٢١١ .

(٥) لە سایتەکانی ئینتەرنێتدا دەیان گوتار و ریپۆرتاج بە فارسی و کوردی دەربارەی زەماوەندی پیر شەهریار بڵاوکراونەتەوە، بڕوانە: سروه سهرابی، پیر شالیار در هورامان مرا به سوی خود کشاند، مراسم باستانی عروسی پیر شالیار در هورامان تخت، www.Pavehpress.ir یکشنبه ١٣ بهم ١٣٩٢، جشن عروسی پیر شالیار، رسوم هورامان، *مراسم کومسای در روستای اورامان تخت کردستان*، *جشن عروسی پیر شالیار زماون* zemawan *یا عروسی* www.hawraman.org، رۆژی ١٠–٠٤– ٢٠١٥، مراسم پیرشالیار، ویکیپیدیا دانشنامه ازاد ...هتد.

(٦) وەك چۆن صۆفیی ناودار یوسفی عەجەمی گۆرانی (م: ٧٦٨ك/١٣٦٧ز) لە نێو کوردا بە باباگوڕگوڕ دەناسرێت .

(٧) چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان، محەممەدی مەلا کەریم وەریگێڕاوەتە سەر کوردی، چاپخانەی سلمان الاعظمي( بەغدا: ١٩٧٠)، ل ٤١، کلیمن هیوار، دائرة المعارف الاسلامیة، مادە سنه،١٢/ ٢٧٦.

(٨) دیارە مەبەست گوتەکەی شێخ عبدالقادری گەیلانییە: " لیس علی باب الحق کُرديٌ مثل ابوالوفا "

(٩) دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە : عبدالصمد توداری، چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان، ل ٤١،علاء الدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بڵاوکردنەوەی کوردستان (سنه : ١٣٨٩ هـ، ش)، ل ١٨٦، مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، ل١٧٥– ١٧٦ .

(١٠) محەممەد ئەمین هەورامانی، کاکەیی، چاپخانەی الحوادث (بەغدا:١٩٨٥)،ل٣٢ .

(١١) وەك : الشطنوفي: بهجة الاسرار و معدن الانوار، ص١٤٣-١٤٤، اليونيني: ذيل مرآة الزمان، حوادث سنوات (٦٩٧-٧١١ هـ)،ص٩٦٦-٩٦٩، التادفي الحنبلي: قلائد الجواهر في مناقب الشيخ عبدالقادر، ص٨٠- ٨١، الشعراني، الطبقات الكبرى، ١/١٣٥ و چەندین كتێبی دی .

(١٢)- ناوی تەواوی: الصُّوفِيّ أبو الْحَسَن عَلِيّ بْن أَبِي بَكْر بْن رُوزْبة بْن عَبْد اللَّه البغداديُّ القَلَانسي العَطَّارُ (ت: ٦٣٣ هـ/١٢٣٥م)، دەربارەی ژیاننامەی بڕوانە: الذهبي، تاريخ الأسلام، حوادث٦٣١-٦٤٠ هجرية .

(١٣) تفاح الأرواح، مخطوط، الورقة ٤١.

(١٤) بە خەتی ڕوونووسكار حسين بن أحمد العجلوني الشافعي، ئەمەش وەصفی دەستنووسەكەیە:

عدد الأوراق: ٧٤ : ١٩ ١٩×١٥سم (١٧×١١سم) الخط نسخ، والحالة جيدة، وهو مجلد بورق مقوى، والحبر أسود، والإظهارات ورؤوس الموضوعات وعلامات الوقف بالحمرة. وعلى الورقة: ٧٠(أ) ما نصه: "على يد .. حسين بن أحمد العجلوني بلداً الشافعي مذهباً، كتبه لشيخه السيد طه سبط الدجاني الحسيني بن إبراهيم الليثي .. والحمد لله رب العالمين". وعلى الورقة: ١(أ) ما نصه: "من كتب العبد الفقير موسى (..) نجل المرحوم الشيخ صنع الله (..) القدسي بن الشيخ (..) غفر لهما". وكذلك:"صاحبه الفقير موسى الخالدي ابن الشيخ صنع الله الخالدي غفر له."

أوله:.. أما بعد فإن في قصص السلف الصالح للسامع المنيب آية رحمة .. ومن كثير مناقبه الصحيح والقليل موسوم بفخر آل زين العابدين بمناقب السيد أبو الوفا تاج العارفين، وقد أتعرض لذكر سلفه وذرية أخيه ومشايخه وأتباعه ومريديه وبعض مناقب خدامه.. النجل عبدالحافظ النور يجتلي أنال ونال القصد من قربه علي فأضحى على الأقوان طرا بمعربي آخره: ومن نجله فرد الزمان محمد علي وداود للقطب الكريم أحمد وجاءت لتاج الدين منهم غاية تمت النسخة المباركة . بڕوانە : نظمي الجعبة، فهرست مخطوطات المكتبة الخالدية- القدس، مؤسسة الفرقان (لندن:٢٠٠٦)،ص٧٣٦.

(١٥)الواسطي، تذكرة المقتفين، الورقة ٨٧ أ.

(١٦) هدية العارفين أسماء المؤلفين وآثار المصنفين، طبع بعناية وكالة المعارف الجليلة في مطبعتها البهية (استانبول: ١٩٥١)، أعادت طبعه بالأوفست: دار إحياء التراث العربي ( بيروت – لبنان)،٢/٦٣ .

(١٧) معجم البلدان، ٤/١٠٠ .

(١٨) قلائد الجواهر،ص٨١ .

(١٩) بنەماڵەی زانیاران، ل١٧٨ .

[20] تذكرة المقتفين، الورقة ١٣ ب، مرآة الزمان،ص٩٦٩، ئەم گوتەیە لە سەرچاوەی دیدا بە شێوەی " أمسيت كرديا وأصبحت عربيا "هاتووە و گەڕێندراوەتەوە بۆ چەند صۆفییەکی دیکەی کورد، بەلاّم ابو الوفا خاوەندی راستەقینەیەتی .

[21] جەژنێك بۆ پیر و بنەمایەك بۆ ئیستوورەی کوردی، ل ٥١–٥٤ .

[22] الكامل في التاريخ،٣٩٢/٧–٣٩٧،٣٩٣–٣٩٨.

[23] خريدة القصر وجريدة العصر، ٥٣٤/٢/٤–٥٣٥ .

[24] کەڵە صۆفییەکی تۆبەکاری کوردە ، لە سەرچاوەکانی صۆفیگەریدا ناسراوە و بەسەرهاتی تۆمارکراوە، لە هۆزی شەنبەکییە کە لە بنەڕەتدا هۆزێکی گوندنشینی دەڤەری هەورامانە و ماچۆ زمانە و ئیستا بە شەبەك دەناسرێن .

[25] تذكرة المقتفين، الورقة ١٥ ب و بڕوانە: السخاوي، الضوء اللامع، ٨٤/١١–٨٥، المقدسي، الانس الجليل،١٤٦/٢ .

[26] تذكرة المقتفين، الورقة ٨٦ ب .

[27] الشطنوفي، بهجة الاسرار، ص١٤٣–١٤٤، اليونيني، ذيل مرآة الزمان، حوادث سنوات(٦٩٧–٧١١هـ)، ص ٩٦٦–٩٦٩، التادفي، قلائد الجواهر، ص٨٠– ٨١، الشعراني، الطبقات الكبرى، ١٣٥/١ .

[28] حەیدەر لەشکری، لە شەریعەتەوە بۆ حەقیقەت (هەولێر: ٢٠١٢)، ل٢٦٤ .

[29] تفاح الارواح، الورقة ٤١–٤٢ .

[30] دەربارەی ژیاننامەی بڕوانە: محمد شریفی، فرهنگ ادبیات فارسی، فرهنگ نشرنو–انتشارات معین (تهران:١٣٩١هـ، ش)،ص٨٢٧–٨٢٨ .

[31] أدوارد براون، تاريخ الادب في ايران، ص٤٠٢–٤٠٤.

[32] تذكرة المقتفين، الورقة ٣ب .

[33] لە سەرچاوەی دیدا ئەم کەرامەتە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی گەڕێندراوەتەوە.

[34] وەك گوایە پێغەمبەر لە رۆژی قیامەتدا لەنێو جەمعی پێغەمبەر شانازیی بەوە دەکات کە ابو الوفا لە ئومەتی ئەوە " وإن رسول الله –صلى الله عليه وسلم– ليباهي به الأمم يوم القيامة فيقول للأنبياء: هل في أممكم كأبي الوفا؟ فلم يكن فيهم غير الانبياء مثله "، تذكرة المقتفين، الورقة ٧٥ ب، مرآة الزمان، ص٩٦٦، قلائد الجواهر، ص٨١ .

[35] " وكان يغلب على لسانه العُجمْة لكونه نشأ بين قوم والدته أكراد بني نرجس يتيماً، وغلبت عليه العُجمة لعِشرتهم، فأصبح كأفصح من يكون من العرب "، تذكرة المقتفين، الورقة ٤٥ب.

(٣٦) "هداية الله تعالى قبيلة من الكرد، لايعرفون الدين ولا يفهمون معاني الالفاظ، على يده"، تذكرة المقتفين، الورقة ٨٦ أ .

(٣٧) راستییەکەی ساڵی ٤٨٨ك/١٠٩٤ ز یە .

(٣٨) ناسناوی نەك ناوی، چونکە لەو دەمانە مستەفا بۆ ناو بە کار ناهات، و پتر سیفەت بوو واتا ئاوەڵناو بوو نەك ناو و لە هەموو مێژووی ئیسلامیدا کەسێك نییە ناوی مستەفا بێت.

(٣٩) بنەماڵەی زانیاران، ل١٧٥–١٧٨.

(٤٠) " فكنت أرى من احوالهم ويبلغني عنهم ما يحسدهم العاقل على مثله "، تذكرة المقتفين،الورقة ٢٤ أ .

(٤١) تذكرة المقتفين، الورقة ٢٤ أ .

(٤٢) " وصنع الشيخ علي العجمي وليمة عظيمة جداً وجمع فيها خلقاً كبيراً من الأولياء والعلماء والأعيان وغيرهم "، تذكرة المقتفين، الورقة ١٠ ب .

(٤٣) الفصول الفخرية في اصول البرية، ص٣٧ .

(٤٤) دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، انتشارات کردستان (سنندج:١٣٨١ هـ .ش/٢٠٠٣م)،ل ١١.

(٤٥) باب و باپیرانی نووسەریش لە موریدانی أبو الوفا بوونە .

(٤٦) الشطنوفي، بهجة الاسرار، ص١٤٣–١٤٤، اليونيني، ذيل مرآة الزمان، حوادث سنوات (٦٩٧–٧١١هـ)، ٩٦٦ – ٩٦٩، التادفي، قلائد الجواهر، ص٨٠– ٨١، الشعراني، الطبقات الكبرى، ١٣٥/١.

(٤٧) بنەماڵەی زانیاران، ل١٧٥– ١٧٦.

(٤٨) چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان، ل ٤١، سروه سهرابی، پیر شالیار در هورامان مرا به سوی خود کشاند؛ مراسم باستانی عروسی پیر شالیار در هورامان تخت، www.Pavehpress.ir یکشنبه ١٣ بهم ١٣٩٢هـ.ش .

(٤٩) واتا عەجەم – ئێرانی بووە نەك عەرەب، ئەمەش بەڵگەیەکی دییە کە گوندەکە لە کوردستان بووە و لەسەردەمی سەلجوقییەوە– سەدەی ٥ك/١١ز– کوردستانی رۆژهەلآت بەشێك بوو لەو هەرێمەی کە بە عێراقی عەجەمی دەناسرا.

(٥٠) " ثم من حين وُضع السيد تاج العارفين –قدس الله سره– لم يذكر الله عز وجل قط عنده ، إلّا ويهتز كالمتواجد ويتحرك لسانه، ثم نمت زروع الأكراد ومواشيهم، وبورك لهم في مواشيهم، وكانوا يتوسلون به في مهماتهم فيقضي الله حاجتهم، واشتهر ذلك فيهم الى يومنا هذا واشتهر قبل شهرته بتاج العارفين بالكُردي نسبة الى أخواله وقوم امه، تذكرة المقتفين، الورقة ٧ أ .

(٥١) "قلة الصلاة ومنع الزكاة، وإهمالهم لكثير من اللوازم الشرعية "، تذكرة المقتفين، الورقة ٢٤أ .

(٥٢) هەرچەندە خەوارج وەك مەزهەبێكی ئیسلامیی دیار كە لـە ریـزی سـوپای عـەلی كـوڕی أبـو تالـب دەرچوون، بەڵام واستی مەبەسـتی لـە خـەوارج لێـرە ئـەو گـرووپ و لایەنانـەن كـە لـە دەرەوەی ئاییـنی ئیسلامن، چونكە لە سەدەی ٥ك/١١ز مەزهەبی خەوارج لـە عێـراق و كوردسـتان نـەمابوون و هیچ ئامادەبوونێكیان نەبوو.

(٥٣) " انه وان كان شريفاً فقد نشأ بين الأكراد عميان القلوب في البوادي ولا يعرف حقيقة الامـر "، تـذكرة المقتفين، الورقة ٢٦ أ .

(٥٤) تذكرة المقتفين، الورقة ٢٦أ–ب وبڕوانە پاشكۆ .

(٥٥) تذكرة المقتفين، الورقة ٦ب ، الورقة ٨٦ب .

(٥٦) دەربارەی چەمك و واتای وشەی گۆران و كێشە و ململانێی نێـوان گـۆران و رەوەنـدی، بگـەڕێوە بـۆ كتێبەكەم: كۆمەڵگای كوردەواری لـە سـەدەكانی ناوەڕاسـت (هـەولێر: ٢٠١٤ )، ل ٥١–٥٧، ٧٨–٨٥.

(٥٧) تذكرة المقتفين، الورقة ٧ب، ٥٤ب، ٧٥ب.

(٥٨) تذكرة المقتفين، الورقة،٧٥ب .

(٥٩) " إن فيهم من يمر على الصراط كما يمر على هذا الجسر، وليس من رأيت مـنهم مـن شـقي، فـاعتبرت أمرهم بعد تفقد طويل، فكنت أرى من احوالهم ويبلغني عنهم ما يحسدهم العاقـل علـى مثلـه، علـى أن ينفع ذلك الجسر عام الاكراد وغيرهم"، تذكرة المقتفين، الورقة ٢٤أ .

(٦٠) دەمـاودەم ئـەم زانیارییـەم بیسـتبوو و بـەڕێز ئـەیوب ڕۆسـتەم بەسوپاسـەوە دەستنیشـانی جێگاكەی بۆكردم .

(٦١) جەژنێك بۆ پیر و بنەمایەك بۆ ئیستوورەی كوردی، ل ٤٦ .

سەرچاوەکان :

١- بە کوردی:

- ئـــەیووب رۆســـتەم، هـــەورامان، لێکۆڵینەوەیـــەکی مێـــژوویی -کولتـــووری، چ٢ (سلێمانی:٢٠٠٨). - حەیدەر لەشکری، لە شەریعەتەوە بۆ حەقیقەت (هەولێر: ٢٠١٢).
- رەووف مـەحموودپوور، جـەژنێك بـۆ پـیر و بنەمایـەك بـۆ ئیسـتوورەی کـوردی، لـە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری (هەولێر: ٢٠٠٩).
- عبدالصمد توداری، نور الانوار در ذراری سید الابرار (ساڵی١٠٩٩ك/١٦٨٨ن)، مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم ئەو لاپەڕە و بڕگانەی وا لەم کتێبەدا پەیوەندیی بە کورد و کوردستانەوە هەیە وەریگێڕاوە بۆ کوردی بە ناونیشانی چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان بڵاوی کردووەتەوە، چاپخانەی سلمان الاعظمي ( بەغدا: ١٩٧٠) .
- علاء الدين سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، انتشارات کردستان (سنە : ١٣٨٩هـ، ش) . - محەمەد ئەمین هەورامانی، کاکەیی، چاپخانەی الحوادث (بەغدا:١٩٨٥)
- مەلا عبدالکریمی مدرس، بنەماڵەی زانیاران، چاپخانەی شەفیق (بەغدا: ١٩٨٤ ).
- مـەحوی، دیـوانی مـەحوی، لێکدانـەوە و لێکۆڵینـەوەی مـەلا عبـدالکریمی مـدرس، انتشارات کردستان (سنندج: ١٣٨١ هـ .ش/٢٠٠٣م) .

٢- بە عەرەبی و فارسی:

- ابن الأثير، عزالدين علي بن محمد الجزري (ت: ٦٣٠هـ/١٢٣٢م).
- الكامل في التاريخ، دار المعرفة (بيروت: ٢٠٠٧) .
- أدوارد براون، تاريخ الادب في ايران، ترجمة ابراهيم امين الشواربي، مكتبة الثقافة الدينية (القاهرة ٢٠٠٤).
- البغدادي، إسماعيل باشا بن محمدأمين بن ميرسليم الباباني (م: ١٢٩٩ك/١٩٢٠).
- هدية العارفين أسماء المؤلفين وآثار المصنفين، طبع بعناية وكالة المعارف الجليلة في مطبعتها البهية (استانبول: ١٩٥١)، أعادت طبعه بالأوفست: دار إحياء التراث العربي ( بيروت - لبنان).
- التادفي، جلال الدين محمد بن يحيى بن يوسف الحنبلي (ت: ٩٦٣ هـ/ ١٥٥٦ م)
- قلائد الجواهر في مناقب الشيخ عبدالقادر، دار احياء التراث العربي (بغداد١٩٨٤).
- ابن السراج، ابوالمفاخر محمد بن الحسن بن عبدالرحمن الدمشقي (ت: بعد ٧١٥هـ/١٣١٥م).
- تفاح الأرواح ومفتاح الأرواح، مخطوط برقم (٢٢٨) اسطانبول .

- الشطنوفي، نور الدين أبو الحسن علي بن يوسف اللخمي (ت٧١٣هـ/١٣١٣م).
- بهجة الاسرار ومعدن الانوار، مطبعة شركة التمدن الصناعية (القاهرة ١٣٣٠هـ).
- الشعراني، أبو المواهب عبدالوهاب بن أحمد بن علي الأنصاري (ت٩٧٣هـ/١٥٦٥م).
- الطبقات الكبرى، دار الفكر (القاهرة ١٩٥٤).
- العماد الاصفهاني، ابوحامد محمد بن محمد(ت ٥٩٧هـ/١٢٠٠م).
- خريدة القصر وجريدة العصر، القسم الرابع، ج٢ (بغداد : ١٩٦٤).
- ابن عنبة، جمال الدين أحمد بن علي (ت:٨٢٨ه/١٤٢٥م).
- الفصول الفخرية في اصول البرية، تحقيق: جمال الدين محدث أرموي (طهران: ١٣٦٣هـ.ش)
- كليمن هيوار (١٨٥٤-١٩٢٧)، دائرة المعارف الاسلامية، الترجمة العربية، مادة سنه .
الواسطي، شهاب الدين أبوالهدى أحمد بن عبدالمنعم (ت: بعد٧٧٧هـ/١٣٧٥م).
- تذكرة المقتفين إثر أولي الصفا وتبصرة المهتدين لطريق السيد أبي الوفا، مخطوط نسخة المكتبة الوطنية بباريس رقم (٢٣٦).
- اليونيني: قطب الدين موسى بن محمد (ت٧٢٦هـ/١٣٢٦م).
- ذيل مرآة الزمان، حوادث سنوات (٦٩٧-٧١١هـ)، تحقيق حمزة أحمد عباس، المجمع الثقافي (ابوظبي: ٢٠٠٧).

## پاشکۆ

چیرۆکی بەموسڵمانبوونی دانیشتوانی هەورامان لەسەر دەستی تاج العارفین ابو الوفا – پیر شەهریار

ومن ذلك ما أخبرنا أن السيد تاج العارفين –قدس الله سره العزيز– سافر مرة لدعوة الخلق الى الحق، فكان زمن امره ان قدم على قرية غالب أمرها خوارج، وجميع اكابرهم متمسكون بذلك المذهب(1)، فدعاهم السيد الى التوبة فامتنعوا، فما زال بهم ما بين ملاطفة ووعظ، ووعد ووعيد، وتخويف وتطميع، حتى أسمعهم المبكي والمضحك، وكان من أكابرهم رجل يسمى فلان ابن قبيلة(2)، وصحبته قوم لايحصون كثرة، فقال له: ايها السيد! ان لي أباً شيخاً كبيراً، وهؤلاء القوم كلهم تحت أمره، فإنه كبيرهم ومستشارهم، وكلهم أتباع له، وله مدة تزيد على اربعين سنة وهو مقعد لا يستطيع حركة، وقد اشار علينا من لا نتّهمه بإحضاره بين يديك، وتفويض امره اليك، وقد جئنا به راجين له على يدك الشفاء، فعسى دعوة او لَحظ تنجدنا به في كشف ضُرِّ هذا المُقعد، وانه لمُلقى على الباب، وقد أوقفت أمر أدخاله بين يديك على إذنك، فهل تأذن لنا في ادخاله؟ فأطرق السيد ملياً كالمُستأذَن ثم أذن لهم، فدخلوا به اليه، فلما نظر السيد اليه قال له: هل لك في التوبة عن هذا المذهب الخبيث وأضمن لك على الله الشفاء؟ .

فقال قبيلة(3): إن حصل الشفاء من ذلك تبتُ، وإن قومي لا يخالفوني، فارجو أن الكل يتوبون ويتبعوني، فأخذ السيد عليه عهداً او ميثاقاً على ذلك، ثم توجه السيد الى الله تعالى ساعة، ثم قام فصلى ركعتين، ثم دعا بالخارجي فشدَّ على يده، وقال: قم بإذن الله تعالى، فقام قبيلة كأن لم يكن أقعد أصلاً! فضج قومه ومن حضر، وكثر التواجد من أهله، وتبادر الى التوبة من قوم قبيلة الأكثرون، ثم ان السيد وعظ قبيلة وذكره بمقدار هذه النعمة، ومقدار بركة من كان مذهبه مباينتهم وبغضهم، وحذره من الارتداد عن هذه التوبة، وقال: إني لأرى قومك يضلونك بعد حين فإن أنت تبعتهم هلكتَ وعاد بك ما عُوفيت منه، وإن أنت خالفتهم ببقائك على هذه التوبة نجَوتَ، وإذا مال قلبك معهم، فاذكر قوله تعالى ﴿وَإِنْ عُدْتُمْ عُدْنَا﴾ سورة الإسراء، الآية ( ٨) فإنك إن عدت عاد ألمك.

فعاهد قبيلة على ذلك، وتبعه غالب قومه في هذا العهد الثاني أيضاً، ثم فارقهم السيد وذهب، فأقاموا على توبتهم تلك أربع سنين، فشاعت توبتهم في اقليمهم كله، وعظم ذلك على أهل مذهبه، فقصدوا قبيلة ومن سائر جهاتهم يريدون قتله، أويرجع الى مذهبهم، واكثروا عليه اللوم والتعنيف والسب والتهديد، فاعتذر لهم بما وقع، فقالوا: انه وان كان شريفاً فقد نشأ بين الأكراد عميان القلوب في البوادي ولا يعرف حقيقة الامر، وقد عافاك الله تعالى منذ أربع سنين، فإذا عدت الى مذهبك فقد حصلت على المَقصَدَين، وظفرت بالنورَين، الشفاء، واتباع آبائك الحنفاء، فلم يزالوا به حتى نكث العهد وتعوَّج الى مذهبه، وتبعه ممن تاب من قومه معه الاكثرون، فعادوا الى ظلمات الضَّلال، فلم يستيقظ قبيلة من المنام في ليلته تلك الا مقعداً كما كان، فأرسل أولاده وبعض أكابر قومه يذكرون للسيد ما اتفق لقبيلة مع قومه، ويستأذنون السيد على إحضاره تائبا بين يديه، فقال السيد: ألم أقل له إذا مال قلبك معهم فاذكر قوله تعالى (وَإِنْ عُدْتُمْ عُدْنَا)، وقد عاد وأعيد عليه ما كان مُسطَّراً في القدم، وقد جف القلم بما حكم، والله يقول الحق وهو يهدي السبيل[٤].

(١) اندثر مذهب الخوارج بالعراق منذ القرن الراقع الهجري، فلم يعد قائما، والواضح ان قصده من الخوارج هنا هو فرق الغلاة والفرق الخارجة عن الأسلام.

(٢)و(٣) كذا ومن السياق يظهر انه يقصد ابن رئيس القبيلة.

(٤) تذكرة المقتفين، الورقة ٢٦ أ–ب.

## ملخص البحث

يدور هذا البحث حول السيرة الذاتية للصوفي الكبير محمد بن محمد النرجسي الكردي والمعروف بابي الوفاء تاج العارفين (٤١٧ -٥٠١ هـ /١٠٢٦-١١٠٧م) والمولود عقب وفاة والده في بلاد مرغا- مَرطا ، وليست في قرية قوسان بجنوبي العراق ، وكان صاحب أحوال وكرامات و مقامات وأحد أهم أعضاء الجماعة الصوفية التي ظهرت بالعراق خلال العهد السلجوقي ، ومدحه الشيخ عبدالقادر الكيلاني وأثنى عليه بقوله : " ليس على باب الحق رجل كردي مثل الشيخ أبي الوفاء "، كما مدحه الشاعر الايراني حكيم سنائي . والهدف من البحث هو اثبات ان ابا الوفا تاج العارفين المعروف في مصادر تراجم المتصوفة ، هو بير شهريار أو بير شاليار نفسه الشهير بين الكرد حتى اليوم ، وذلك استناداً الى الدلائل التاريخية والشواهد الأثرية ، فابو الوفاء تاج العارفين كما كان يعرف في حياته بينهم بكاكيس أي الأخ الأكبر ، صار يعرف منذ مماته ولحد الآن بشهريار أو بير شهريار- وبير تعني بالكردية والفارسية الشيخ ، المرشد الديني ،الزعيم الروحي ، وشهريار أي الملك الأعظم بين أقرانه ، كبير المدينة ، عظيم القوم. وتحيى ذكرى بيرشهريار -أبي الوفا على المستوى الشعبي سنويا ، في أحتفال جماهيري كبير وصاخب من قبل اهالي منطقة هورامان تخت -محافظة كردستان الايرانية ويحضره سكان المناطق المجاورة وذلك حين يحل منتصف فصل الشتاء بالتقويم المحلي الكردي ويصادف اليوم الخامس من شهر شباط وتستمر لمدة أسبوعين .

## Abstract

This research revolves around the biography of the great Sofi Mohammed bin Mohammed Kurdi and narcissistic known as Abu Al Wafaa Taj Al Arifeen crown (417-501 AH / 1026-1107m) and born after his father's death in the country Marga, and not in the village of Qosan southern Iraq, The owner of the conditions and dignities and shrines and one of the most important members of the Sufi group, which emerged in Iraq during the Seljuk period, Sheikh Abdul Kader al-Gailani praise and praised him by saying "It is not right on the door of a Kurdish man like Sheikh Abu alwafaa ", Also praised the Iranian poet Hakim Sanaiy. The aim of the research is to prove that Abu Wafaa Taj Al Arifeen crown sources known in the translations of the Sufis, is Taj Al Arifeen Pir Shahriar himself famous among the Kurds even today, and based on the historical evidence and archaeological evidence, Abu al-Wafa crown as he was known in his life, )kakis (including any older brother, became known since his death and yet Pir Shahriar or Pir Shalyiar- and Pir means in Kurdish and Farsi-Sheikh, religious leader, spiritual leader, and Shahriar any King the greatest among his peers, great city, great people . And commemorating Pir Shahria -abo Wafa at the grassroots level annually at a ceremony in a large rally and vociferously by the people of Hawraman Takht area - Iranian Kurdistan and attended nearby areas population and that while solves the middle of winter the local calendar Kurdish and marks the fifth day of the month of February and continue for two weeks.

# زانایەکی ئاوارەی بێ ناز
# مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی

وا بزانم زیاد نەڕۆیشتووم ئەگەر بڵێم: سەردەمێك کوردستان وەك کانگایەك وا بووە زانای هەڵهێناوە. بەڵگەی ئەم قسە لەوەدا روونە کە تەماشای لاپەڕەی مێژووی زانایانی هەر یەکێك لە مەڵبەند و پایتەختە زانستییەکانی جیهان دەکەین ناوی چەند زانای گەورەی کورد لە ریزی پێشەوەی ئەو زانایانەدا دیارن کە پلەی (امام الحرمین) و (موفتی و، قازی و، شێخ الاسلام...) یان بووە و دواتریش لەو شوێنانەیدا لەتەك ئەوپەڕی رێزدا ژیاون و ئارامگای هەمیشەییشیان هەر لەو وڵاتانەدا بووە[1].

کام شوێن لە وڵاتەکانی: حیجاز، شام، حەڵەب، قاهیرە، یەمەن و... هەیە ناو و ئارامگای زانایانی کورد نەبووبێ بە مەدالی پڕ شکۆی سنگیان؟ خۆ باسی ئەستەمووڵ هەر مەکە! چونکە ماوەیەکی دوور و درێژ پایتەختی خەلافەتی ئیسلامی بووە و زانایانی جیهانیش بۆ نان و بژێو یان بۆ ناو و شوورەت روویان لەو شوێنە کردووە.

زانایانی کوردیش کە لەبەر زۆرییان و نەبوونی جێگای شیاو لە وڵاتی خۆیاندا لە لایەکەوە و، نەبوونی میر و بەرپرسی وا کە دڵیان بداتەوە و وەك پێویست رێز لە خۆیان و زانستەکەیان بگرێ لە لایەکی دیبەوە، بە لێشاو roوویان لە ئەستەمووڵ کردووە و، گەلێکیان کتێبی باشیان لە بوارە جیاجیاکانی زانستدا داناوە و نوسخەی شاهانە و شیاوی دانراوەکەیان خستووەتە بنهەنگڵیان و تا لای شێخولئیسلام نەوەستاون و زۆریش وا بووە دانراوەکەیان بەس بووە بۆ ئەوە کە دەرگای خزمەتی باش و ژیانی شیاویان بۆ بخاتە سەر پشت و لەژێر سێبەری بەری رەنج و کۆششیاندا هەتا دوایی ژیانیان بحەوێنەوە.

ئەو زانایانەی کورد کە چوونەتە ئەستەمووڵ و دوای خزمەتی دیار و شیاویان لەو شوێنەدا و ماڵئاواییشیان لە ژیان هەر لەو شوێنەدا، ئەگەر زانای گەلانی دی بوایەن مێژوویان لەسەر لاپەڕەی زێڕین دەنووسینەوە و مێژووی پڕشکۆیانیان ئەکرد بەمایەی شانازیی پشتاوپشتیان، بەڵام بەداخەوە ئێمەی کورد وا ژیانی ئەو زانایانەمان پشتگوێ خستووە و ئەوەندە کەمتەرخەمییان لە ئاستیاندا لەوە زیاتر هەڵنەگرێ.

من ناوی دەیان – و بگرە سەدان – زانای کوردم لەلایە کە ڕێگەیان کەوتووەتە ئەستەمووڵ و بە شێوەیەك لە شێوەکان لەو شوێنەدا خزمەتی وا شیاویان کردووە و پیشانیان داوە کە ناویان لە (سجلی عوثمانی) و (ئەرشیفی عوثمانی) و (مەشیەخەی عوثمانی) و...دا تۆمار کراوە و لەسەر ژیان و بەرهەمیان نووسراوە.

رۆشنبیرانی ئەمڕۆی کورد ئەوەندە خۆیان ماندوو نەکردووە لا لە چەند دانەیەکیان بکەنەوە و هیچ نەبێ ناویان بە زێد و زادگای خۆیان شاد بکەنەوە و بڵێن: ئەم ناوچە ئەم زانا بەڕێزانەی پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە.

با زۆر دوور نەڕۆین دوو کەڵە زانا و گەورە شاعیری وەك (نالی) و (حاجی قادری کۆیی) ماوەیەکی باش لە تورکیا و ئەستەمووڵدا ژیاون و بڕوا ناکرێ ئەرشیف و سیجیللی ئەو وڵاتەیان لێ بێ ئاگا بێت، بەڵام ئێمە چیمان بۆ کردوون؟ لەم دواییانەشدا ناوی چەند زانای ناو ونبووی کورد لەم لاو لەولا سەریان هەڵداوە کە گەیشتوونەتە ئەستەمووڵ و لەوێ شوێندەستی خۆیان دیاری کردووە و شوێنپەنجەیان لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو دیارە و کاریگەریان هەیە، وەك (کاتب)[٢] و (نەفعی)[٣] و (ناجیم)[٤] و ... ئایا کەس دڵی داچڵەکاوە تا بە دەنگیانەوە بچێت و لەو بێنازیی ئاوارەییەدا تۆزی لەبیرچوون لەسەر مێژوویان لابات و پێیان بڵێ: خەم مەخۆن ناهێڵین هەتا هەتایە لەم بێنازییەدا بمێننەوە؟

**مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان:**

ئێستەش نازانم ساڵی ١٩٧٣ منێکی بێ ئەزموون و بێ چنگ و پەل چۆن چووم بە گژ (بێستوون)دا! گومانی تێدا نییە کەسێکی بێ ئەزموون بێ ئەوەی پێشینەیەکی هەبێ لە بواری نووسیندا، دەست بەرێ بۆ گەورەترین کتێبی کوردی



**مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان**

تا ئەو سەردەمە، وەك ئـەوە وایـە بچـێ بـە گـژ (شـاهۆ) یـان (بێسـتوون)دا. هەرچۆنی بوو ئـەو پڕكێشـییەم كـرد و خـوداش یارمـەتی دام بەسـەر ئـەو كێـوەدا سەركەوتم.

ئەو كاتە یەكێك لە چنگە كووڕێكانم ئەوە بوو چۆن شتێك لەسـەر ژیـانی ئـەو مامۆستا مەزنە (مامۆستا مەلا رەشـید بـەگی بابـان) بنووسـم. بەهـەر زەحمـەت و سەختییەك بوو شتێكم نووسی، بەڵام سوور ئەمزانی كە ئەو شتە لە قەد رێزی ئەو پیاوە نییە و ئەشمزانی لە توركیا شتی باش لەسەر ژیـانی هەیـە، بـەڵام (ئاسمـان بەرز و زەوی سەخت)، منێكی بێ دەستەڵات چی لەگـەڵ ئـەو باسـە بكـەم؟ ئـەوە بوو چاپی یەكەمی كتێبەكە بەو شێوە رۆیی، جـارێكی دیـش بـەرگی یەكـەم چـاپ كرایەوە و هیچم دەست نەكەوت. زۆرم پرسی و هانام بـۆ لای بابانـەكان و نـەوەی مامۆستا مەلا رەشید برد، ئەوانیش وەك پێویست بە دەنگمەوە نەهاتن.

ساڵی (٢٠١٢) سەفەرێكی توركیام بۆ رێكەوت و لەوێوە بەتایبـەتی چـووم بـۆ ئەسـتەمووڵ، لـەو سـەفەرەدا ئـەوەم لەبەرچـاو بـوو كـە بتـوانم پرسـیاری ژیـانی

مامۆستایانی کورد بکەم. توانیم بەهۆی دڵسۆزێکەوە بگەمە (دائیرەی مەشیەخەی ئیسلامی) لەوێ بەپێی ئەو دەرەتانەی لە دەستدا بوو و بە گوێرەی ئەو کاتەی لە بەردەمدا بوو ناوی چەند کەسێکم پرسی و زانیاریم لەسەر هەندێکیان دەست کەوت، تا گەیشتمە سەر مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان، خۆشبەختانە دوای هەندێ گەڕان و هەڵدانەوەی لاپەڕە کەوتم بەسەر لاپەڕەی ژیانی مامۆستادا و وێنەیم گرت. لەو کاتەوە تا ئێستە داوام لە چەند کەسی تورکیزان کردووە بۆم تەرجەمە بکەن، بەڵام کەس نەچووە ژێر ئەو بارە و هەر یەکەیان بە جۆرێك دەستی نا بە ڕوومەوە. تا ناچار بۆ ئەمەش رووم لە مامۆستای بەڕێز (ئەمین شوان) نایەوە[٥]، ماڵی ئاوا بێ و لەش و چاوی ساغ بن، ئەمجارەش دەستی بەڕوومەوە نەنا و بابەتەکەی زۆر بەجوانی بۆ تەرجەمە کردم و بوو بە هۆی ئەوەی ئەم لاپەڕە زێڕینەی ئەم مامۆستا مەزنەی کورد بخەینە سەر لاپەڕەی مێژووی زانایانی کورد، هیوادارم ئەمە سەرەتایەك بێ بۆ روونکردنەوە و خۆشکردنی رێگە بۆ نووسینەوەی ژیانی ئەو دەیان و صەدان مامۆستا ئاوارە و بێ نازانە کە تۆزی کەمتەرخەمی و لەبیرکردن خەریکە یەکجاری ناویان لەبیر دەباتەوە.

**مەلا رەشید بەگ کوڕی عەبدولفەتاح بەگی بابانە**

ساڵی ١٢٨٨ی ك. بەرامبەر بە (١٢٨٧)ی ماڵی لە شارۆچکەی سلێمانی لە دایك بووە. سەرەتای زانستەکان و پلەی روشدییەی لەوێ وەرگرتووە و پاش خوێندنی عەرەبی و زانستە ئایینییە باڵاکان هاتووە بۆ دەری سەعادەت (ئەستەموول. وەرگێڕ) لە مزگەوتی شەریفی ئایا صۆفیە ئامادەی دەرسەکانی پێشنوێژ و دەرسبێژی ئەوێ عوثمان نووری ئەفەندیی کیفیلی و (کنعریلی نووسراوە) بووە. لەوێ زانستی تەواو کردووە و لە (٢٤)ی جیمادولئوولای ساڵی ١٣١٢دا ئیجازەنامەی وەرگرتووە و پاش پێشکەشکردنی تاقیکردنەوەی پێویست و ئیثباتی ئەهلییەت پلەی جێگری دەرسوتنەوەی وەرگرتووە و لە شەواڵی ساڵی ١٣٣٠دا دەستی بە دەرسوتنەوە کردووە. دوایی لە (٢٢)ی رەجەبی ساڵی ١٣٣١دا ئیجازەی مۆڵەتی تەواوی دەرسوتنەوەی پێ بەخشراوە و لەسەر ئەو کارە بەردەوام بووە و لەو سەردەمەدا کە لە (مدرسة القضاة – فێرگەی قازییان) بووە لە (٢٤)ی شەعبانی ١٣٣٥دا پلەی مۆڵەتی قازیێتی بە پلەی (تایبەت) وەرگرتووە.



زمانەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی بەنووسین و قسەکردن دەزانی. هەروەها لە بەڵگەنامەی باری کەسییەتیدا (ترجمەی حال ورقەسی) نووسراوە بە زمانی کوردی دەدوێ.

ناوبراو لەبەرئەوەی لە مزگەوتی پیرۆزی ئایا صۆفیە دەرسی وتووەتەوە لە (١٣)ی مانگی شەواڵی ساڵی ١٣٣١ تا (١٢)ی ئەیلوولی ١٣٢٩ی رۆمی بە چوارصەد قورووشی مانگانە دامەزراوە. لە (٣٠)ی ئەیلوولی ١٣٣٢ دا براوە بۆ خزمەتی سەربازی لەوێ بە ٤٠٠ قورووشی مانگانە بووە بە بنووسی یەکەی یەدەگی (احتیاط) چوارەم و لەبەر ئەوە مانگانەی دەرسوتنەوە و پێشنوێژییەکەی براوە. بەڵام ئەم مانگانە کەڵەکە کردووانەی کە لە کاتی پێشنوێژ و دەرسوتنەوەدا وەری گرتوون لە ٣٠ شەعبانی ١٣٣٤ دا بە گوێرەی نووسراوی ژمارە ٣١/٣٣٨٩١٩ لە یەکی ئاغستۆس – ئابی ١٣٣٤ ەوە بە تەواوەتی حساباتی مووچەکانی راست کراونەتەوە و لە (١) ئەیلوول (١١)ی کانوونی یەکەمەوە هەر مانگەی صەد قورووش هاتووەتە سەر مانگانەکەی و بەوە بووە بە شەش صەد قورووش و لە (١٥)ی مارتی ١٣٣٤ ەوە لە بنووسی یەکەی چوارەمی وەزارەتی جەنگ کۆتایی بە خزمەتەکەی هێنراوە و گەڕاوەتەوە بۆ پێشنوێژی و دەرسوتنەوەکەی و لە ١٢ ی

ئـەیلوولی ١٣٣٥ ەوە مانگانەکـەی بـە یـەکگرتوویی بـووە بـە هـەزار قـورووش، لەسەرەتای دەستبەکاربوونییەوە لەسەر دەرسوتنەوە لە مەدرەسەکەیدا و بوونی بە مامۆستای زمانی عەرەبی سەر لەنوێ مانگانەکەی تەسوییە کراوە و ئـەو (٤٠٠) قورووشەی کە بە زیادە وەری گرتووە لێی وەرگیراوەتەوە. پاش ئـەوە دیسـانەوە لە رۆژی لێوەرگرتنەوەی زیادەکەوە چووەتەوە سەر کاروباری دەرسـوتنەوە و لـە (٢)ی کانوونی یەکـەمی ١٣٣٦ ەوە لـە مەدرەسـەکەی لـە پـۆلی یەکەمـدا دەرسـی عـەرەبی وتووەتـەوە و دوایـی هـەر لـەوێ لـە ئـەیلوولی ١٣٣٧دا دەسـتی کـردووە بەوتنەوەی دەرسی (فیقه) و لەبـەر ئـەوە مانگانەکـەی دابـەزێنراوە بـۆ دووصـەد قورووش.

نـاوبراو لـە (٣) ئاغسـتۆس (ئـاب)ی ١٣١١دا لـە شارۆچـکەی سـلێمانی لـە قوتابخانەی روشدییەی عەسکەرییە کراوە بە مامۆستای ئیملا و لە (١)ی کـانوونی یەکـەمی ١٣١٦دا کـراوە بـە مامۆسـتای عـەرەبی و پـاش کرانـەوەی (ئەعدادییـەی مـولکی) لـە شـاری نـاوبراو لـە ٢٧ی شـوباتی ١٣٢٦دا لـەوێ دەرسـی زانسـتە ئایینییەکان و عەرەبی و تورکی و ریاضیاتی بە پلەی وەکیل مامۆستا وتووەتەوە. دواتـر لـە یـەکی تشـرینی یەکـەم هەنـدێ بەڵگـەی نووسـراو لـە بەڕێوەبەرایـەتیی قوتابخانـەی سـەربازی و ئەعـدادی مـوڵکی دۆزراونەتـەوە کـە کـارکردنی بـەم پلـە پشتڕاست دەکەنەوە.

جگە لەمانە نـاوبراو لـە (٢٠)ی صـەفەری ١٣٣٦دا لـە دەرەوەی ئەسـتەمووڵ دەرسی وتووەتەوە.

مانگانەی دەرسوتنەوەی ناوبراو و مێژووی وەستاندنی و دوایی گەڕاندنەوە و خستنەوەسەر و داگرتنی و گشت بەڵگە فەرمییە پێوەندیدارەکان بەم بابەتەوە لـە تۆمـار و هـەروەها تـەذکـەرەی نوفـووس و ئیجازەنامـە و مۆڵەتنامـەی تـەدریس و دەرچـوونی لــە (فێرگــەی قازییــان) و گەیشــتنی بــە پلــەی مامۆســتایی و دوو مەضبـەطـەی پشتڕاستکراوە لە دۆسییەکەیدا، پارێزراون.

ناوبراو ناوی لە تۆماری کادرۆ (ملاك)ی ئەیلوولی ١٣٢٩ دا تۆمار کراوە و هـەر لەوێ مانگانەکەی و بوونی بە هەزار قورووش مانگانە، جگە لە چوارصەد قورووش لە بەرامبەری وتنەوەی زمانی فارسیدا بەیان کراوە و لەو یاسایەی لە (٣)ی مارتی

١٣٤٠ دا دەرچوو بە گوێرەی شێوازی ئەو قوتابخانەی سەر بە مەعاریف کران ئـەو لە سەرەتادا لـە تاقیکردنـەوەکانی دەرەوەی مەدرەسـەکەی تـا نیسـانی ١٣٤٠ لـە کاردا بووە، دەردەکەوێ لە پاشان دەستی لەکاری دەرسوتنەوە هەڵگرتووە.

لە (٣٠)ی مارتی ١٣٤١ دا بووەتەوە بە پێشنوێژ و مودەرِیسـی (دەرسعام) و پاش ئەوە (٢٠٠) قورووش خراوەتە سەر مانگانەکەی بە گشـتیی مانگانـەی کـراوە بە هەشت صەد قورووش.

* * *

لەم لاپەڕەی ژیانی مامۆستا مـەلا رەشـیدەوە گـەلێ کـەلێنی نـەزانراو لەسـەر ژیانی روون دەبنەوە کە پێش ئەمە ئێمە ئاگامان لێیـان نـەبووە، بـەڵام ئەمانـەش هەموو شتێکی ژیانی ئەم مامۆستا نین لە ئەستەموولدا، بـەڵکو ئـەم لاپـەڕە زیـاتر بایەخی تێـدا بـە فرمانـە فەرمییـەکانی و مووچـەکانی و شـوێنی کـارکردنی دراوە. هەروەها ئەم لاپەڕە تا کۆتایی ژیانی و ساڵی کۆچی دوایی تێدا نییـە، وەك باسـی خوێندنی پێش ئەستەمووڵیشی و ئیجـازەی مەلایـەتیی لـە کوردسـتان تێـدا نییـە، چونکە ئەوە روونە مامۆستا مەلا رەشید لە سلێمانی و دەوروبەری خوێندوویەتی و دوا قۆناغی خوێندنی لای مامۆستا مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی بووە و ئیجازەی مەلایەتی لەخزمەت ئەو زاتەدا وەرگرتووە.

هەروەها ئەم لاپەڕە باسی بەرهەم و دانراوەکانی ناکا، کە گومان لەوەدا نییە زانایەکی وا چوار زمانی بـە باشـی زانیبـێ و خـاوەنی توانایـەکی بـاڵا بووبێـت، لـە نووسـین و کتێـب دانانـدا بـەوەوە نەوەسـتاوە هـەر بـە دەرسـوتنەوەوە خـەریك بووبێت، چونکە دەبینین پێش چـوونی بـۆ ئەسـتەمووڵ زانایـەکی بـەتوانا بـووە و کتێبـی وەك شـەرحی فەریـدەی شـێخی سـیووطی نووسـیوە و نوسـخەی نایـابی بەخەتی خۆی لە (د . ع)دا پارێزراوە.

هەروەها دیارە ئەم پوختە لـەبارەی کـار و مووچـەکانییەوە لـە دۆسـییەکەی وەرگیراوە و بێگومان دۆسییەکەی شتی زیاتری تێدایـە. جگـە لەمانـەش مامۆسـتا مەلا رەشید لە چـەند شـاری تورکیـادا قـازییێتی کـردووە و قازییـەکی باڵادەسـت و شارەزا بووە، باسی ئەمەش لـەم لاپـەڕەدا نییـە. دیـارە ئەگـەر هـەوڵ بـدرێ دوور

نییە فایلی لە ریزی مامۆستایانی ئایا صۆفییە و قازییەکانی ئەستەموولیشدا بدۆزرێتەوە و زۆر نزیکە دانراوی نایابیشی مابێت و بدۆزرێتەوە.

هەر لەم بارەوە موژدەی ئەوە بە شەیدایانی زانینی ژیانی ئەم پیاوە مەزنانە دەدەم کە نامیلکەی (قەواعیدی نەحو و صەرفی کوردی) ئەم مامۆستایە کە پێشتر من زۆر بۆی گەڕابووم و دەستم نەختستبوو، ئێستە دۆزراوەتەوە و نوسخەی لای دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوولە و کار بۆ بلاوکردنەوەی دەکات.

مەبەستم لەوەی کە لێرەدا نووسیم ئەو زانیارییە تازانەیە – بە لای ئێمەوە – کە لە سیجیللەکانی ئەرشیفی عوثمانییەوە دەستکەوتوون. چونکە پێشتر لەسەر ژیانی ئەم مامۆستایەم نووسیوە و بەپێی توانا لە هەندێ لایەنی ژیانیم کۆڵیوەتەوە و لە توانای زانستیی مامۆستا دواوم[٦]، بەلام نە ئەمەی کە لێرەدا نووسیومە، نە ئەوانەی پێشتریش هیچیان و بە گشتیانیش لە ئاستی ئەوەدا نین وەك پێویست ژیانی ئەم مامۆستا مەزنەی کورد روون بکەنەوە و ئەوەی شیاویەتی بیخەنە سەر لاپەڕەکانی مێژوو. گومان لەوەدا نییە و – بڕواش ناکرێ – پیاوێك خاوەنی ئەو هەموو توانا زانستییە بێت و چوار زمانی بە نووسین و قسەپێکردن زانیبێت و خولیای نووسینیش لەسەریدا بووبێت، ئەو ماوە دوورودرێژە لە تورکیا جگە لە کتێبی (اقتران النیرین) با گەورەترین کتێبیشی بێ، کە لە کۆتایی تەمەنیدا بە ماوەیەکی کەم دایناوە، کتێبی دی دانەنابێ!

من گومانم بۆ ئەوە دەچێ ئەگەر هەوڵی باش بدرێت و نەوە و بنەماڵەکەی بدۆزرێنەوە، گەلێ شتی باش و نایاب لە شوێنەواری و بەلگەنامە و پێوەندیی لەگەڵ کوردانی دانیشتووی تورکیادا و نامە و شوێنەواری ئەوانیش کە بۆ ئەمیان ناردووە دەست بکەون، بەتایبەتی کە خاڵێکی سەرنجڕاکێش لە دەقی ئەو لاپەڕەدا کە لێرەدا نووسیمان دەری دەخات ئەم مامۆستا گیانێکی کوردایەتیی پوخت و بەتینی تێدابووە و کوردایەتی لێ تکاوە، چونکە لە بارەی زمانزانیی مامۆستاوە، دوای ئەوە کە نووسراوە عەرەبی و تورکی و فارسی و کوردی دەزانێ، نووسراوە بە کوردی دەدوێ و قسە ئەکات. هەر ئەمەیشە کە دەبینین مامۆستامان دوا یادگاری دوای خۆی بە زمانی شیرینی کوردی بەجێ هێشتووە کە کتێبی (اقتران النیرین)ە (٩) نۆ بەرگییەکەیەتی.

وەك وتم ناوی زیاد لە هەزار زانا و ناوداری کورد لـە دەسـتدایە کـە چـوونەتە تورکیا و هەر یەکەی بە جۆرێك و شێوەیەك لەو وڵاتـەدا ژیانیـان بەسـەر بـردووە و بـە زۆریـیش نەگەڕاونەتـەوە بـۆ زێـد و وڵاتـانی خۆیـان، لـە تورکیـا و دەوڵـەتی عوسمانیی پێشوودا مێژوو پارێزراوە و ئەرشیف هـەڵگیراوە، بـێ ئـەوەی سـەر لـە نەتەوە و بنەچەی کەسەکان کرابێتەوە.

جـا لــە سووچـێکی سـجیلێکدا لــە لاپەڕەیەکـدا ئەوەنـدە لەسـەر ژیـانی مامۆسـتایەك بدۆزرێتـەوە، دەبـێ ئەگـەر بـە وردی بەشـوێن ژیـانی ئـەو صـەدان مامۆستا و پیاوە گەورانەدا بگەڕێین کە لە تورکیادا بوون و کاری گەورە و پۆسـتی دیاریان لە ئەسـتۆدا بـووە و خزمـەتی شـیاویان کـردووە.. دەبـێ چیمان دەست بکەوێت؟ بێگومان ئەگەر ئەمە – هەموویشی نا – ئەنجام بدرێت مێژوویەکی زێڕین و شکۆمەندی زانا و ناودارانی کورد دەنووسرێتەوە.

في بحر وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون

ويغوص فيه باذلا روحه فان ظفر على جوهر

المطلوب فقد فاز فوزا عظيما

وان تلفت مهجته فقد وقع اجره على الله

لقد تنجز وتم تحرير هذه الكلمات الطاهرات

الموشحة بالآيات البينات للقطب الصمداني

والغوث الرحماني الشيخ عبد القادر الجيلاني

قدس الله سره وافاض علينا بره بقلم العبد الفقير

مولان بك زاده عبد الرحمن ناظم النقشبندي

السليماني وابن حضرة الشريف

ابن الشريف ابن الشريف ذي الدولة

افندينا عبد الاله پاشا

١٣٠٧

**پەراوێزەکان:**

١) چاوساغم لە ئەستەموولدا برای بەرێز موفید یوکسول بوو، کە کوردێکی دڵسۆز و کۆکەرەوەیەکی بەسۆزی ئاسەوار و بەڵگەنامە و کولتووری کوردە و شارەزاییەکی زۆر باشی لە گەلێ بواردا هەیە و، گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی لە وێنەی دەستخەت و شوێنەواری زانایان و ناودارانی کورد کۆکردووەتەوە. بە پێ گۆڕستانی (فاتیح) و چەند گۆڕستانی دەوروبەری (مەکتەبەی سلێمانی) گێڕام. بەلای گۆڕستانێکدا بردمی دەرگاکەی داخرابوو، وتی: گۆڕی مەحموود پاشای بابان لەم گۆڕستانەدایە. لە گۆڕستانەکانی دیدا چەندین گۆڕی دیار و ناسراوی پیشاندام کە هەندێکیان کێلەکانیان شکابوو خەریك بوو لە بەین ئەچوون، زۆریان ناوی شارەزووری و بەرزنجی و حەیدەری و عیمادی و وانی و ئامودی و... لەسەر کێلەکانیان هەڵکۆڵرابوو. هەندێك لەو گۆڕستانانە مزگەوتی بچووکیان لە پاڵدا بوو کە بەشێکیان داڕووخابوون و بووبوون بەکەلاوە، پێی ئەوتم: ئەمە مزگەوتی فلان مەلای کوردە و ئیجازەی بە چەند کەس داوە و تا کەی لێرەدا دەرسی گوتووەتەوە و ئەمەش ئارامگاکەیەتی، کە چەند کەسی کوردیش لە دەوری بوون.

هەروەها کاك موفید ناوی چەند شاری دوورە دەستی ناو تورکیای ئەهێنا کە وێنەی کێلی گۆڕستانەکانیانی لەلا بوو ئەیوت: بزانە لەو شوێنە دوورە دەستەدا چەند زانا و پیاوی ناسراوی کورد ژیاون و دواییش لەوێ کۆچی دواییان کردووە و ئەوانەش کێلی گۆڕەکانیان و نیشانەی ئارامگاکانیانن؟

٢) کاتب شاعیرێکی کوردی خەڵکی سلێمانییە بە گەنجی رووی لە ئەستەموول کردووە و لای شێخولئیسلام عارف حیکمەت گیرساوەتەوە، شاعیر و خەتخۆش بووە، دیوانی شیعریم لە کتێبخانەی مەلیك عەبدولعەزیز لەشاری مەدینە دۆزییەوە و ساڵی ٢٠٠٨ دەزگای ئاراس چاپی کرد. پێش ئەو کاتە لە هیچ سەرچاوەیەکی لای خۆماندا ناوی نەهاتبوو.

٣) نەفعی شاعیرێکی کوردی خەڵکی دەوروبەری سلێمانییە، هاوچەرخ و هاودەمی نالی بووە و نامەی شیعرییان بۆ یەکتر ناردووە، لەشام و ئەستەموول ژیاوە، بە کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی شیعری هەیە. دیوانەکەی لە ئەستەموول دۆزرایەوە ساڵی ٢٠١٠ لە ئەکادیمیای کوردی چاپ بوو.

٤) زانایەکی گەورەی کوردە، لە سەرچاوەکانی لای خۆماندا ئەوەندەی لە بارەوە زانراوە کە لە هەوادارانی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، بەڵام ئەم زاتە کە چووەتە ئەستەموولْ بووە بە یەکێ لە زانا ناودارەکانی تورکیا و یەکەم کەس بووە فیهرەستی دەستخەتی لە ئەستەموولْ کردووە و چەندین کتێبی دیار و گەورەی هەیە.

منیش لەخزمەت دەستخەتێکی نایابیدام کە ساڵی ١٣٠٧ بۆ عەبدوڵڵا پاشای بابانی نووسیوەتەوە.

٥) پێشتریش داوام لەم مامۆستا بەرێزە کرد پێنج بەڵگەنامەی تورکی لەسەر مەولانا خالید بۆ تەرجەمە کردم. خودا پاداشتی بداتەوە.

٦) لە پێشەکیی (اقتران النيرين في مجمع البحرين)دا بەپێی ئەوەی ئەو کاتە دەستم کەوتووە لەسەر ژیانی مامۆستا و خوێندنی و ئیجازە وەرگرتنی و ماڵ و خێزان و خانەوادەییم نووسیوە.

(بڕوانە اقتران النيرين ف مجمع البحرين. دانراوی مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئیرشاد، بەغدا، ١٩٧٣ز – ١٣٩٣ك. ل: ١٤) هەروەها لە پاشکۆیەکی دوا بەرگی کتێبی ناوبراودا هەندێ شتی دیم لەسەر مامۆستا مەلا رەشید نووسیوە.

دواتریش لە بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورددا تەسەلتر لەسەر ژیانی ئەم مامۆستا بەرێزەم نووسیوە.

(بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە رێگەی دەستخەتەکانیانەوە. دانراوی محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی حەوتەم، دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم ٢٠٠٧، ل: ٢٦٩).

# لێکەوتەکانی ئەنفال لە رۆمانی (فرمێسکی بەفر)ی عەبدولقادر سەعید

**توێژەر: کەیفی محەمەد عەزیز**

بەشی زمانی کوردی_ فاکەڵتی ئاداب _ زانکۆی سۆران

## پێشەکی

پرۆسەی ئەنفال لە ئەنجامی ئەقڵی پێکهاتەی دەسەڵاتی بەعس و هاوشێوەکانییەتی، تێڕوانێکی سیاسی و شێوەیەکی دیاریکراوی ئۆرگانیزەی کۆمەڵگەی کوردییە، بۆیە ئەو دەسەڵاتەی لەپشتی پرۆسەی ئەنفالەوە بوو، خاپوورکردن لەپێکهاتەیدایە . ئەم توێژینەوەیە لەژێر ناونیشانی لێکەوتەکانی ئەنفال لە رۆمانی (فرمێسکی بەفر)ی عەبدولقادر سەعیدە. ئەنفال چەندین لێکەوتەی لەسەر تاکی کوردیی پاشماوەی ئەنفال جێهێشتووە، ئەم توێژینەوەیە لە چوارچێوەی لێکەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، شیکاری بۆ رۆمانەکە کردووە.

**<u>هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکە:</u>** – دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە سەردەمە جیاوازەکاندا نەتەوەی کورد، بە شێوازی جیاواز ئەنفال کراوە، بەمەش ئەنفال هەردەم لەپێشماندایە، بۆیە بەپێویستمان زانی ئەم توێژینەوەیەی بۆ تەرخان بکەین.

**<u>میتۆدی توێژینەوەکە:</u>** – ئەم توێژینەوەیە پەیڕەوی میتۆدی (وەسفی – شیکاری) کردووە.

**<u>سنووری توێژینەوەکە:</u>** لەنێو پانتایی رۆمانی کوردی، رۆمانی (فرمێسکی بەفر)ی بەنموونەی توێژینەوەکە وەرگیراوە.

**<u>ناوەرۆکی توێژینەوەکە:</u>** لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم، باسی چەمك و زاراوەی ئەنفال و ئەو لێکەوتانەی لەم پرۆسەیە کەوتۆتەوە، کراوە، لە بەشی دووەمدا، بەشێوەی پراکتیکی لەسەر رۆمانەکە پراکتیزە کراوە، لە کۆتاییدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان ریزکراوە .

**دەربارەی چەمکی ئەنفال:**

ئەگەرچی ئەم زاراوەیە (ئەنفال)، پەیڤێکی قورئانییە و بنەڕەتێکی عەرەبی هەیە، بەو دەستکەوتانە دەوترێت کە دەکەوێتە دەست سوپای ئیسلام، لەدوای پێکداچوونیان لەگەڵ بێباوەڕاندا بەهۆی خیانەتکاری و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانیان. ئەنفال وەکو وشەیەك لە زمانی عەرەبی کۆی (نفل)ە، کە بەواتای (غنیمة) دێت، بەمەش ئەنفال واتای زیادە دەسکەوت دەگەیەنێ[1]، کەواتە ئەو دەسکەوت و ماڵ و سامانەیە بە شەڕ لە موشریکەکان دەسەندرێتن، زانایان بۆ واتای ئەنفال بۆچوونی تایبەتییان هەیە، وەکو دەفەرموون (الانفال وهو الغنیمة اي کل نیل ناله المسلمون من اموال اهل الحرب) واتە: بریتییە لەو ماڵەی دەست موسوڵمانان دەکەوێت، بەمەش وشەی ئەنفال عەرەبییە و بەمانای دەستکەوت دێت[2]، جگە لەمەش واتایەکی دیکەی بۆ لێکدراوەتەوە، کە بە (تالآن و بردن — النهب والسلب)، لێکی دەدەنەوە، کە عەرەب بەر لەئیسلامیش لەهەر جەنگێکدا سەرکەوت بێت، چ ماڵ و سەروەت و سامان و کەلوپەل هەبووبێت، بۆخۆی تالآنی کردووە، پیاوەکانی کوشتووە و ژن و منداڵیشی دیل کردووە و کردوویەتییە کۆیلە[3]. ئەنفال ناوی هەشتەمین سورەتی قورئانی پیرۆزە، کە لە (٧٥) ئایەت و(١٨٣١) وشە و (٥٢٩٤) پیت پێك هاتووە[4]. حکومەتی بەعس بۆ ناونانی کردەی ئەنفال، ئەم ناوەی لە هەشتەم سورەتی قورئان وەرگرتووە، هەڵبژاردنی ئەم ناوە لەلایەن حکومەتی بەعس چەندین مانای هەبووە، بۆ بەکافرکردنی کوردو کوشتن و لەناوبردنی دانیشتوانی لادێیەکان بوو. بەعس توانی چەمکە دینییەکان بقۆزێتەوە بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی خۆی، چونکە چەمکە دینییەکان باکگراوندێکی ئیلاهییان هەیە و موقەدەسن و ناتوانرێت بەئاسانی لەدژی بوەستیتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کۆی جڤات بەئاسانی قبوڵی دەکات و توانای ڕووبەڕوویان نابێت. لەڕووی سیاسیشەوە باشترین پاساو دەبێت بۆ شاردنەوەی تاوانەکان یاخود ڕەوایەتی پێدانی. بەمانایەکی دیکە خۆحەشاردان لەپاڵ دیندا، یاخود خۆ پۆشین بە پۆشاکی دین، باشترین هەلە کە بەکاربهێنرێت بۆ جوانکردنی کارە دزێوەکان، چونکە ئەو کات ماف بەکەس نادەیت بتخاتە بازنەی لێپێچینەوەو گومانەوە[5] .

ئەم سورەتە (ئەنفال)، لەساڵی دووی کۆچیدا لەمانگی ڕەمەزان و لەکاتی شەڕی بەدری گەورەدا دابەزیوە، لەئەنجامی ئەم شەڕەدا موسوڵمانان بەسەر کافرەکاندا زاڵ بوون، دەستکەوتێکی زۆریان بەدەست هێنا هەرچەند کافرەکان لەڕووی ژمارەوە زۆر لە موسڵمانەکان زیاتر بوون، دوای تێکشکاندنی بت پەرستەکان هەندێك لە موسوڵمانان دوای کافرەکان کەوتن و هەندێکی تریان پاسەوانی پێغەمبەریان (د.خ) دەکرد و هەندێکی تریان دەستکەوتەکانیان کۆ دەکردەوە، بەم پێیە موسوڵمانان بوون بە سێ کۆمەڵەی جیاوازەوە، بۆ دابەشکردنی دەستکەوتەکان، کۆمەڵەی یەکەمیان: پێیانوابوو ئەوان دوژمنیان ڕاوناوە دەستکەوتەکان بۆ ئەوان بێت، کۆمەڵەی دووەمیان: پێیانوابوو ئەوان پێغەمبەریان (د.خ) پاراستووە و دەسکەوتەکان بۆ ئەوان دەبێت. کۆمەڵەی سێیەمیان: دەستکەوتەکانیان کۆ دەکردەوە و پێیانوابوو موڵکی خۆیانە. بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە سورەتی (ئەنفال) دابەزی کە لەیەکەم ئایەتدا دەفەرمووێت ((يسئلونك عن الانفال قل الانفال لله والرسول فاتقوا الله واصلحوا ذات بينكم واطيعوا الله ورسوله ان كنتم مؤمنين)) واتە: ئەی پێغەمبەر لە بارەی ئەنفالەوە پرسیارت لێ دەکەن تۆش بڵێ ئەنفال هی خواو پێغەمبەرە، وەتەقوای خوا بکەن و چاك بن لەنێوان خۆتاندا، گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بن ئەو کاتە لەئیماندارانن[٦]، سەبارەت بەئەنفالی کورد، کۆمەڵێ کاربەدەستی بەعسی دوژمنی دین خۆیان بە جێگرەوەی پێغەمبەر و (د.خ) یارانی داناو گەلی کوردی موسوڵمانیان بەکافرو بێ دین تاوانبارکرد، بڕیاریان دا ئەنفالیان بکەن .

سەرانی بەعس قورئانیان بەکارهێنا وەکو پرۆسەیەك لە فکری ناسیۆنالیزمی شۆڤینی بەعسدا، کە بەرجەستەکراوی فۆرمەلەی عەقڵانیەتی سیاسییانەیە، ئەنفالی پێ جێبەجێ کراوە، لە ڕێگەی دەسەڵاتی ڕەهاوە بۆ ونکردنی جەستەی تاکی کورد، بەپاڵپشتی گەورەترین تەکنیکی وێرانکردن، بۆ بەرگریکردن لەدەسەڵات و مانەوەیان، ((ساڵی ١٩٨٨، ساڵی ئەنفال بوو، بۆیە پێویستە وەك نموونەیەکی بەرجەستەی وەحشیگەری لە کتێبی مێژووی عەرەبیدا بنووسرێتەوە))[٧]، هەرچەندە دوای جەنگی عێراق و ئێران بەعس توانایەکی

لەشکری وەهای پێکهێنابوو، کە بتوانێ هێزێکی مەزنتر لەباکوری عێراق بەکار بهێنێت و گورێکی نوێ بەجەنگ دژ بەکورد بدات . ئەنفال لەو روانگەیەوە سەرچاوەی گرتبوو، کەوا ولآتانی عەرەبی نیشتمانی نەتەوەی عەرەبن و هەرچی کەمینەی نەتەوەی تر لە ولآتانی عەرەبیدا دەژین (میوان)ی، نەتەوەی عەرەبن، ئەبێ ئەرکی خۆیان وەکو میوان جێبەجێ بکەن، چونکە ئەوان لەخاکی نیشتمانی عەرەبدا دالّدەدراون، لەو رۆژگارەوە دژایەتی گەلی کورد و حاشالێکردن و سڕینەوەی بوون و مافەکانی، بوون بەسەرەتایەك بۆ ژێرخانی فیکری بەعس، بۆ لەناوبردنی فیزیکی و گەڕان بەدوای کات و زەمەنی گونجاو و لەبار بۆ پراکتیزەکردنی مەرامە شۆڤێنییەکانیان . دژە کورد بوون، بوو بەسیما و خەسڵەتی بەعس، بۆیە ئەنفال ((هێرشێکی راستەوخۆی سیستماتیزەکراوی هەمەلایەنەیە بۆسەر کۆی ژیانی کۆمەڵگەیەك وەك گشتێکی دابەش نەکراو بۆسەر بوونی مادی و مەعنەوی خەڵکانێك تا پلەی فەناکردنی یەکجارەکییان))[٨]، بەمەش ئەنفال بۆ بەعسییەکان ناوی ئۆپەراسیۆنی بێ ویژدانانەی قڕکردنی کورد بوو، بۆیە ئۆپەراسیۆنەکە بەهێرشێکی چڕی ئاسمانی دەستی پێکرد و بەپاشیدا هێرشی هێزی زەمینی شار و گوند و زەویوزاری خاپوورکرد .

### لێکەوتەی سیاسی لە پرۆسەی ئەنفال:

بۆئەوەی باس لە ئەنفال بکەین و لێکەوتەکانی ئەو پرۆسەیە بەر دیدە بخەین، پێویستە باس لەسیاسەتی بەعس و جیهانبینییەکەی بکەین، وەکو ئەزموونێك، ئەم تێفکرینەی لەپشتی سیاسەتی بەعسەوە بوو، ئەنفال لە هەناویدا چەکەرەی کرد، ئەمەش پەیوەندی بە کەلتوورێکە، کە ناسیونالستی عەرەب لەپشتییەوەیە، کەلتوورێك ئارەزووی خوێن لە هزریدا چەسپیوە. بەعس ئامرازێك بوو، کە بووە تاقیگەیەك بۆ تاقیکردنەوەی هەموو جۆرە ترس و تۆقاندنێك بۆ تاکی کورد، بەمەش ئەزموونێکی خوێناوی تایبەت بە خۆی خولّقاند، بۆیە لە دیدی بەعسەوە، (( مرۆڤی کورد بونیادێکی پلە دووە، ژیان و هەبوونی بایەخێکی گرنگی نییە، لە دیدی ئەو دەسەڵاتانەوە رووداوێکی وەکو ئەنفال و قەڵاچۆکردنی بەکۆمەڵی ئینسانی کورد لەقووڵاییدا مایەی دڵخۆشی ئەو دەسەڵاتانەن کە هاوبەشن لە داگیرکردنی کوردستاندا))[٩]، هەرچەندە ئەنفال پرۆسەیەکی سیاسی

پێشوەخت ئامادەکراوە و بەتێفکرین و ئایدۆلۆژیای بەعس، ئامانجی خاپوورکردن و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی شیرازەی ژیانی لادێ نشینەکانی کورد بوو، ستراتیژیەتی ئەم پرۆسەیە لەرێگای تۆڵەکردنەوە و رقێکی لەمێژینەی رژێمە فاشیزمەکانی عەرەبە بەرامبەر نەتەوەیەك، کە هەر لەدروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە داوای ماف و ئازادییەکانی دەکات. بەعس و ئایدۆلۆژیاکەی تاکی کوردیان بە ناپاك و خیانەتکار، تاڕادەی نا مرۆڤبوون وێنە کردووە، چونکە لەگەڵ هاتنە سەرتەختی دەسەڵات و دەستگرتن بەسەر تەواوی جومگەکانی فەرمانڕەواییدا، بەعس دروشمی (امة عربية واحدة، ذات رسالة خالدة)، کە (نەتەوەیەکی عەرەبی یەکگرتوو خاوەن پەیامێکی نەمرە)یان بەرزکردەوە. میشیل عەفلەق* لە نووسینێکیدا ئەم راستییە روونده‌کاتەوە، دەڵێ: دەمانەوێ هەموو خەڵکی بکەینە خۆمان و بیروباوەڕمان هەموو کەسێکی میللەتەکەمان بگرێتەوە(١٠)، بەمەش لەم نێوەندەدا کورد وەکو بوونەوەرێك و نەتەوەیەکی نامۆ سەیر کراوە . ئامانج و سیاسەتی بەعس لە پەیڕەو و پرۆگرامەکەیدا سەرچاوەی گرتووە، (( نەتەوەی عەرەب خاوەن پەیامێکی نەمرە، بەشێوازێکی نوێباو لە قۆناغێکی مێژووییدا خۆی دەنوێنێ، ئامانجی پاراستن و بەرزڕاگرتنی بەها مرۆڤایەتییەکانە، پاڵپشتی لەپێشکەوتن و گەشەپێدان و گونجان و هاوکاری نێوان گەلان دەکات )) (١١)، هزر و فەلسەفەی بەعسی ناسیۆنالیزمی پان عەرەبیزم، لە بەرگێکی ئاینیدا، ئەنفالی کردە رەوایەتیدانێك بۆ هاڕینی ئێسك و پرووسکی نەتەوەی کورد، ئەم ئایدۆلۆژیا رۆژهەڵاتییەی بەعس لەکاژێکی ئاینیدا بۆ چەواشەکردن و چاوبەستکردنی ئیمانداران و بڕوادارانی ئاینی ئیسلام لەژێر گوتاری سورەتێکی قورئان مەرامە گڵاوەکانی خۆی پەردەپۆش کرد. زاراوەی بەعس بەمانای زیندووکردنەوە و بووژانەوەی کەلتووری عەرەب دێت، چونکە خۆی بەشوێنگرەوەی گشت عەرەب دەزانی، بۆیە ((نەتەوەی عەرەب پێویستە خەبات بکەن بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی یەکگرتووی عەرەبی، کۆکەرەوەی گشت عەرەب بێت))(١٢)، بەردەوامیش بووە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجەی .

دەسەڵاتی بەعس هەموو رەهەندەکانی ژیانی تاکی کوردی خستبووە ژێر چەپۆکی خۆی، تەنانەت سەروەت و سامان و خوێنی تاکی کوردیشی بەموڵکی

بەعس دەزانی، ئامانجی سیاسی بەعس دەبوو تاکی کورد لە کوردبوون بخات و عێراقیبوون بئاخنێتە هزریانەوە، هەردەم لەدیدی بەعسەوە کورد بەپاشکۆی کەلتووری عەرەب سەیرکراوە، ئەم وێنەیەش کاتێك بەرجەستە دەبێتەوە، سەدام حسێن دوای ئەنفالەکان بەجلی کوردییەوە سەردانی کوردستان دەکات، ئەمە ئاماژەیەکە بۆ نەبوونی هیچ نەتەوەیەك جگە لە عەرەب و ئەوەی بەجیاوازتر لەعەرەب سەیری خۆی بکات بەناپاك و خیانەتکار مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت . ستراتیژییەتی بەعس بۆخۆی (نەتەوەی عەرەب)، مانای گشتگیرکردنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی مرۆڤەکان و کۆمەڵگە و سیاسەتە و، دەستکاریکردنێکی فرە رەهەندی تاك و کۆمەڵگە و نەتەوەیە، بەمەش بەعس تەنها دەسەڵاتێك بووە لەماوەی سی ساڵی تەمەنی خۆیدا، فۆرمێکی تایبەتی بە کۆمەڵگە و چارەنووسی مرۆڤەکانی بە ئایدۆلۆژیای خۆی دیاریکردووە، وەکو هەر دەسەڵاتێکی دیکەی ستەمکار، جۆرێك بووە لە کەلتوور، کە ریشەکەی لە هەناوی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و مێژووەکەی چەکەرەی کردووە .

بەعس پێیوابوو نەتەوەی کورد بەهۆی راپەرین و شۆرشە بەردەوامەکانی، هەرەشەیە بۆ سەر یەکپارچەیی خاکی عەرەب و هەردەم بە مەترسی زانیوە لەسەر خاکی عێراق و وڵاتانی عەرەبی ناوچەکە، (( حیزبی بەعس ئەوەشی دووپات کردبووەوە کە نایەوێ لە فەرمانرەوایەتیدا هیچ لایەنێکی هاوبەش بێت ئەو بەتەنها تاکە حیزب دەمێنێتەوە کە فەرمانرەوایەتی عێراق دەکات))(١٣)، لەم سۆنگەیەوە حیزبی بەعس رەوایەتی ئەوەی بەخۆی بەخشیوە، کەوا لەپرۆسەیەکی بەناو ئەنفالدا نەتەوەیەك قڕ بکات، بۆیە پرۆسەی ئەنفال بە ئامانج گرتنی لادێیەکانی کوردستان بوو، لە لادێیەکانەوە دەستی پێکرد، ئەویش مەبەستی لێدان بوو لەباری ئابووری نەتەوەیەك و خاپوورکردنی ژێرخان و سەرخانی ئەو نەتەوەیە ، کەواتە بۆخۆی تێفکرینێکی سیاسییانەی لەدواوەیە، بەعس مەبەستی بوو لە رێگاری ئەنفالەوە داخوازییە سیاسی و کەلتووری و ئابوورییەکانی نەتەوەیەك بسرێتەوە، بەمەش چارەسەری ئەم داخوازییانەی دایە دەست لەشکر و سوپا بۆ ئەوەی لەم رێگایەوە دەنگی نەتەوەیەك کپ بکەن . لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەنفال کردەی کۆمەڵکوژی نەتەوەیەکە، کە راپێچی ژێر لمی

بیابانەکانی خوارووی عێراقی بەناو نیشتمان کران ، ئەمەش یەکێکە لە تاوانـەکانی سەدەی بیستەم، کە دەسەڵات و ڕژێمێك بەپێی نەخشە و پیلانێکی داڕێژراو کەوتە جێبـەجێکردنی، هــەنگاو بەهــەنگاو بـۆ لـەناوبردن و قەڵاچـۆکردنی نەتەوەیـەك ، لێکەوتەکانی ئەنفال تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بەشێوەو ڕوخسـاری جیـاواز بـەردەوامی هەیە، جەستە ژێرلمکراوەکان گوزارشت لـە نەتەوەیـەك دەکـەن تـا ئـەمڕۆ ئـەنفال دەکرێت. یەکێك لەو ڕەهەندانەی ئەنفال شـکۆ شـکاندنێکی خۆێناوییانـەی بـەعس بوو بۆ سەر کەسیەتی تاکی کورد، لەڕێی دامەزراوە سەربازی و ئەمنییەکانییـەوە، ئایدۆلۆژییەکەی پرۆسەی ئەنفال داسەپاندنی سزای مەرگی بە کۆمەڵ بوو، بەسـەر بەشێك لە دانیشتوان و هاوولاّتیانی کورد جێبەجێ کرا.

### لێکەوتەی کۆمەڵایەتی لە پرۆسەی ئەنفال:

قەڵاچـۆکردنی نەتــەوەی کـورد بەشـێوەیەکی سیسـتەماتیك، لێکەوتــەی فەلسـەفە و ئایـدۆلۆژیای بـەعس بـوو، کێشـەی نەتـەوەی کـورد بـوو بەیـەکێك لـە گرنگترین بابەتی ئەجیندای حیزبی ناوبراو. ئـەنفال وەکـو دیاریدەیـەك وابەسـتەی ئامادەگی هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و مێژووی سەردەمێکە، کۆمەڵێك گۆڕانکـاری نێگـەتیڤی هێنایـە کایـەوە، وایکـرد ئـەنفال لـە ڕەهەنـدە سیاسـییەکەیەوە بچێتە قـووڵایی پنتـە کۆمەڵایەتییـەکانی کۆمەڵگـەی کوردییـەوە، کـە ئەمـەش کۆمـەڵێك گۆڕانکاری بەدوای خۆیدا هێناوە بەشێوەیەك ترس و تۆقاندن بـووە بـە یـەکێك لـە ناسنامەی دەسەڵات و حوکمڕانی بەعس، ((داگیرکردنی دام و دەسـتگا مـەدەنی و کەلتوورییـەکان و کردنیـان بـەدام و دەسـتگای حیزبـی و، وە تیرۆرکردنـی فـەزای گشـتی، بـەعس هەرچـی میراتـی مـەدەنی بـوو خـاپووری کـرد))[١٤]، بەشـێوەیەك وێنەیەکی دڕندانەی نیشانی تـاکی کـورد داوە ، کـەوا بـیر لـە شـۆڕش و خـەبات و بەرخودانی نەتەوەیی نەکاتەوە .

کردەی ئەنفال چەندین نەهامەتی و چارەڕەشی لـە جەسـتەی تـاکی کـوردی پاشمـاوەی ئـەنفال دروسـتکردووە، ئاسـەوارەکانی ئـەو پرۆسـەیە و لێکەوتـەکانی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی هەموو ئەو مرۆڤانەوە دیارە، کەوا لـەپاشماوەی ئەنفالـدا بــەجێماون . ئــەنفال پرۆســەیەك بــوو، بــۆ لەبەریــەك هەڵوەشــانەوەی دۆخــی کۆمەڵایـەتی تـاکی کـورد و کاریگـەری خراپـی لەسـەر هـەموو چـین و توێـژەکانی

کۆمەڵگە دروستکردووە، بەمەش هەزارەها ژنی بێ پیاو و هەزارەها منداڵی بێ دایك کرد، بۆ ئەم راستییەش شارۆچکەیەکی وەکو (سەنگاو)، کە یەکێکە لە ناوچەکانی کوردستان، کە کردەی ئەنفالی تیایدا جێبەجێ کرا، (( نەوەدو سێ گوندی لەخۆگرتبوو.... نزیکەی هەژدە هەزار کەسی تیادا دەژیان، کە زۆربەیان لە شاڵاوەکان تیادا چوون و شونبزر کران))[١٥]، بەمەش کردەی ئەنفال گۆڕانکاری بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردیدا هێناوە، بەجۆرێك بووەتە تێکشکانی لایەنی سایکۆلۆجی پاشماوەکانی ئەنفال، تەنانەت زۆربەیان بەشێکی زۆری ژیانیان لەچاوەڕوانی ئازیزانیاندا بەسەر بردووە، بەشێوەیەك کاریگەری کردۆتە سەر جەستە و رەنگ و روخساریان، بۆیە ئەم کاریگەرییە تەنها لەسەر پاشماوەی ئەنفالدا نییە بەڵکو کار دەکاتە سەر ئەو نەوەیەی لەدوای پاشماوەکانی ئەنفال لەدایك دەبن . شاڵاوەکانی ئەنفال خۆی لە سووتماککردنی سەر زەوینی چەندین گوندی کوردان بینییەوە، سەرەڕای شوێن بزرکردنی هەزاران گەنج و لاو و پیری بە دواوە بوو، زۆرێك لەو کەسانەی لەدوای پرۆسەی ئەنفال بەزیندوویی مانەوە نەیانتوانی خۆیان لەبەردەم ئەو گۆڕانکارییانە بگرن کە ئەنفال لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، چونکە گۆڕانێك نەبوو لەسەر بنەمای بەرەو پێشبردنی سیستەمی خێزانی.

دەسەڵاتی بەعس دەیزانی کە بەبێ قەلاچۆ کردنی خەڵك لە دێهات و شارۆچکەکانی کوردستان ناتوانێ هێزی پێشمەرگە لە خەڵك دابڕێ، هەر بۆیە سیاسەتی وێرانکردن و چۆلکردنی دێهاتەکانی گرتە بەر، باغ و رەز و کانیاوەکانی کوێر کردەوە و دانیشتووانەکەی رەوانەی ئۆردووگاکانی زۆرەملێ کرد، ((بەعس بۆ راگرتنی هەڕەشەی بەرەی باکور، هەموو کوردی گوندەکانی راگوێزایەوە و گوندەکانیشی تەخت کرد، ئەو کردارانە هەموو ناوچەکانی گرتەوە، پتر لە چوار هەزار و پێنج سەد گوند وێرانکران))[١٦]، بەڵکو ناوچەی گەرمیان بەگشتی کەوتە بەر شاڵاوی ئەم سیاسەتە دژە مرۆییە، بەوەش رانەوەستا و دەستی کرد بە وێرانکردنی شاری قەڵادزێ و سەرەتاکانی وێرانکردنی شاری رانیەشی دەست پێکرد، پێشتریش شاری هەڵەبجەی تەفروتوونا کردبوو، پێنج هەزار کەسی لە خەڵکی ئەم شارەی بە گازی ژاراوی تیاچووبوون[١٧]. بۆ ڕیشەکێشکردن و

ئابلۆقەدانی هێزەکانی پێشمەرگە و جیاکردنەوەیان لە گوندەکانی کوردستان، ئەوە بوو ڕووبەرێکی زۆر لە خاکی کوردستانی بەتەواوی چۆڵ کرد و قەدەغەی کرد و هەموو ئەو گوندانەی دەکەونە ئەو ڕووبەرەوە وێران و خاپوورکران و دانیشتوانیان گوازرانەوە بۆ شارە دروستکراوە زۆرەملێکان تا بەتەواوی لەژێر چاودێریی ڕژێمدا بن و نەتوانن هیچ پەیوەندی و هاوکارییەکیان لەگەڵ پێشمەرگەدا هەبێت .

ڕژێم سوور بوو لەسەر ئەوەی هەموو شوێنەوارێکی ژیان و ئاوەدانی لەو ڕووبەرە قەدەغەکراوەدا بسڕێتەوەو، کاری کرد بۆ ئەوەی هیچ جۆرە ژیان و ئاوەدانییەکی بۆ نەگەڕێتەوە، بۆیە هەر کەس لەو ناوچانەدا بوایە لە سێدارە دەدرا، ئەو ڕووبەرەی ئەنفالی تیاکرا وەکو شادەماری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردی بوو، بۆیە ڕژێم بەو شێوەیە ئاوەدانیی ئەو ڕووبەرەی سڕییەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بەرهەڵستیی پێشمەرگە کۆتایی پێ بهێنێت. ڕژێم بۆ چۆڵکردن و خاپوورکردنی دێهات و ئاوەدانیی ئەو ڕووبەرە فراوانەی کوردستان هەموو جۆرە چەکێکی قورس و سووك و چەکی کیمیاییشی بەکار هێنا، جگەلەوەی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە گوندنشینەکان (بەتایبەتی لە گەرمیان) گوازرانەوە بۆ باشوور کە لەوێ بێسەروشوێن کراون. ئامانجێکی ڕژێم لەو پاکتاوە ڕەگەزییەی کورد لە گەرمیان ئەوە بوو کورد لە ناوچەکەدا نەهێڵێت تا بتوانێت خێڵە عەرەبەکانی تێدا نیشتەجێ بکات بۆ گۆڕینی باری دیمۆگرافیای پارێزگای کەرکوك . لە هەموو هەڵمەتەکاندا گوندەکان ئابلۆقە دەدران و تاڵان دەکران و کشتوکاڵیان دەسووتێنرا و ماڵ و قوتابخانە و مزگەوتەکان خاپوور دەکران .

لووتکە و ترۆپکی هەموو ئەو تاوانانە خۆی لە (ئۆپەراسیۆنی ئەنفال)دا بینییەوە. کە بە پرۆگرامێکی داڕێژراوی بەعس بەڕێوە چوو، تاوانێك کە چەند مانگێك لە (٢٣ ی شوبات تا ٦ ئەیلولی ١٩٨٨) لە هەشت قۆناغی جیاجیادا بەبەرچاوی وڵاتانی جیهان و کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی و نەتەوە یەکگرتووەکان و (UN) و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ ڕوویداو زیاتر لە (١٨٢٠٠٠) سەدو هەشتا و دوو هەزار هاووڵاتی کوردی سیڤیل تیایدا شوونبزرکران و زیاتر لە (٤٥٠٠) گوند و لادێی کوردستانیش تەفرو توونا کراو سووتێندران [١٨]، بەڵام بەداخەوە کەسێك دەنگی

لێوە نەهات و دنیا لێی بێ دەنگ بوو، تەنانەت ئەم تاوانە بێ وێنەیە لەگەڵ ئاستی گەورەیی و دڕندانەی نەبوونە کەرستە و هەوێنی دەزگاکانی راگەیاندن و لەساتی خۆیدا نەورووژێنران، پێویستە ئەوەش بگوترێت کە بەر لە ئۆپەراسیۆنی ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ دا پێشتریش سیاسەتی جینۆسایدی کوردان بەچەند شێوازێك ئەنجامدراوە. لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی رابردوودا بەدەیان هەزار هاوڵاتی کوردی فەیلی شوونبزر کران و لە ساڵی ١٩٨٣ دا زیاتر لە ( ٨٠٠٠ ) هەشت هەزار هاوڵاتی بارزانی بەپرۆسەیەکی داڕێژراوی رژێمی بەعس بێ سەروشوێن کران و ئێستاش نازانرێت چارەنووسیان چییە.

### قۆناغەکانی پرۆسەی ئەنفال:

تاوانی ئەنفال، پرۆسەیەکی نەخشە بۆ داڕێژراوی رژێمی بەعس بوو، بۆ لەناوبردن و سڕینەوەی مۆرکی نەتەوایەتی کورد و لەناوبردنی گشت شوێنەوارێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی. بۆ ئەم کارە دەسەڵاتی بەعس عەلی حەسەن مەجیدی بەپێی بڕیاری (١٦٠ لە ٢٩ ئازاری ١٩٨٧) رایسپارد، لێپرسراویەتی هەرێمی باکوری عێراق بگرێتە دەست، ئەم پرۆسەیە لە ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨ دەستی پێکرد و بەسەر (٨) قۆناغدا دابەشی کرد لە (٦) ناوچەی جوگرافی جیاوازدا، سەرجەم قۆناغەکانیش لە ٦ ی ئەیلولی ١٩٨٨ پاش رووخاندنی هەموو گوندەکانی کوردستان کۆتایی هات[١٩] . بۆ پیادەکردنی ئەم پرۆسەیەش رژێم هێزێکی گەورەو پڕ چەکی بەتازەترین و ترسناکترین شێوە بەکارهێنا، هێرش و پەلامارەکانی ئەنفال لەلایەن هێزە نیزامییەکانی هەردوو فەیلەقی یەك و پێنجەوە ئەنجامدران، بە پاڵپشتی یەکەی فەیلەقەکانی، تر کە لەبەرەی شەڕی ئێراندا نەبوون، گاردی کۆماریش بەشداری قۆناغی یەکەمی ئەنفالی کرد، ئەو یەکانەی تریش کە بەشدارییان کرد، هێزی تایبەت (قوات الخاصة) و هێزی کۆماندۆ (مغاوير) و هێزی کوتوپڕ ( قوات الطواري). لەپاڵ هێزە سەربازییەکانی حکومەتی عێراق، نزیکەی (٣٠٠) فەوجی خەفیفە لە کوردستاندا هەبووە، کە پتر لە (٢٠٠ هەزار) چەکداری بەناو جاشی کوردیان تێدا کۆکرابووەوە [٢٠].

**قۆناغی یەکەمی پرۆسەی ئەنفال/ لە (٢٣ /٢ تا ١٨ / ٣ / ١٩٨٨):**

سنووری پەلاماری ئەنفالی یەك بریتی بوو لە (دوکان، بنگرد، زێی بچووك، ماوەت، چوارتا، ئەزمەر، سووسێ، سووورداش)ی سەر بەپارێزگای سلێمانی دەستی پێکرد، لە سەعات ١:٣٠ نیوەڕۆ بۆ سەعات ٢ی شەوی ٢٣ ی شوبات بوو کە خەڵکی یاخسەمەرو سەرگەڵوو و بەرگەڵوو لەتاریکی و باراندا بەدەنگی ناڵەو زرمەی راجیمە بەئاگاهاتنەوە. ئەم بۆردومانە بە هەموو نیازو مەبەستێك، بەیەکەم تەقەی پەلاماری ئەنفال دەژمێردرێت. دوای نزیکەی یەك مانگ لە شەڕو پێکدادان و رووبەڕووبوونەوەی سەخت لەنێوان پێشمەرگە و سوپای عێراق لە رۆژی ١٨ / ٣/ ١٩٨٨ یەکەکانی سوپا رژانە ناو سەرگەڵوو بەرگەڵوو لە رۆژی ١٩ / ٣ / ١٩٨٨ دا بە بەیانی ژمارە (٣٠٨٧) لە هەموو دەزگاکانی راگەیاندنی خۆیەوە گێرانی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی وەکو مژدەیەك بڵاو کردەوە، لە رۆژنامەکانی (**الثورة**)ی ژمارە (٦٥٠٨)، رۆژنامەی هاوکاری (٩٥٩)ی هەمان ساڵ. ئەم پرۆسەیە بەسەرپەرشتی لیوا روکن (سولتان هاشم) بوو [٢١].

**قۆناغی دووەمی پرۆسەی ئەنفال/ لە ٣/٢٢ تا ١/ ٤/ ١٩٨٨:**

قۆناغی دووەمی ئەنفال بۆسەر ناوچەکانی (قەرەداغ، بازیان، دەربەندیخان) بوو، وەکو نەریتی خۆی رژێم سەرەتای هەر قۆناغێکی ئەنفال بە هێرشی کیمیاوی دەستی پێدەکرد، بۆیە ( ٦ ) رۆژ دوای کارەساتی هەڵەبجە لە ٢٢/ ٣ / ١٩٨٨ گوندی (سێوسێنان) بەسەختیو بە شێوازی بەعسییانە درایە بەر کیمیاوی. بۆیە ئەم چەکە بوو بەسامناکترین چەك کە دژی کورد بەکار بهێنرێت، ئەم هێرشە بە دەستپێکی قۆناغی دووەمی ئەنفال دائەنرێ، لەئەنجامی ئەم کیمیابارانەدا وێڕای زیانێکی زۆری مادی، بوو بەهۆی شەهیدبوونی زیاد لە (٦٦) کەس و برینداربوونی دەیانی تر لە ناو شەهیدەکاندا (٣٠)یان منداڵ بوون. پاش ئەوەی رژێم ئەم ناوچەیەی داگیر کرد، سەرجەم گوندەکانی ئەم ناوچەیەی رووخاند کە نزیکەی (٨٠) گوند و (٢٢٤١) خانوو کە (١٢٢٥٤) کەس لەم ناوچەیەدا دەژیان، نزیکەی (٥٦٣٧) کەس بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن و سەرنگوم کران. پاش رووخانی گشت گوندەکانی ئەم ناوچەیە ئەنفالی دوو لە ١ ی نیسانی ١٩٨٨ کۆتایی ئەم شاڵاوەش هات [٢٢].

**قۆناغی سێیەمی ئەنفال/ لە ٧/ ٤ تا ٢٠ / ٤ / ١٩٨٨:**

ئـەم قۆناغـەی ئـەنفال بـە پـڕ زیـانترین و ترسـناکترین پرۆسـەی ئـەنفال دادەنرێت، کە زۆرترین مرۆڤی کوردی تیادا ئـەنفالکرا، سنووری ئـەم ناوچـەیە لـە رۆژئاواوە شارێی نێوان شاری کەرکوك و شارۆچکەی دوزخورماتووە، لە باکورەوە رێگـای کـەرکوك – چەمچـەماڵ، لـەلای رۆژهەڵاتـەوە چـیاکانی قـەرەداغ و لـە باشووریشـەوە هەرسـێ شارۆچـکەی کـەلار و کفـری و پێبـازە بۆسـەر ناوچـەکانی (چەمچـەماڵ، سـەنگاو، قادرکـەرەم، دوز، کفـری، کـەلار، بێبـاز، تیلـەکۆ)، ئـەم ناوچانە سەر بەهـەر سـێ پارێزگـای (کـەرکووك، سـلێمانی، دیـالا) بـوون، ئـەمیش فـراوانترین هێرشـی ئـەنفال بـوو کـە پـتر لـە (٥٠٠) گونـدی گرتـەوە سـەرەڕای تەختکردنی ٤ ناحیە. لە رۆژی (١٤ / ٤/ ١٩٨٨) لووتکەی هێرشی ئەنفال بوو، لەم رۆژەدا بـەپێی خەمڵانـدنی ( کۆمیتـەی بـەرگریکردن لـە مـافی قوربانیـانی ئـەنفال) نزیکەی (٢٠) هەزار لە ژن و پیاو و پـیرو منـاڵ کۆکرانـەوە و بـەئیڤای سـەربازی و تراکتۆری گوندنشینەکان رەوانەی قەڵا سەربازییەکەی (قورەتو) کران و لەوێشەوە بەرەو چارەنووسی نادیار رۆیشتن، هەر بۆیە ئەم رۆژە کرا بە رۆژی (ئەنفالـەکان)، ئەم هێرشەی قۆناغی سێیەم لە رۆژی ٢٠ / ٤ / ١٩٨٨ کۆتایی هات و یەك گوند لە گەرمیانـدا بـە پێـوە نـەماو رووخێنـرا، خەڵکەکەشـی بـەزۆری لـە قـادر کـەرەم کۆکرانـەوە و پـاش تـەواوبوونی ئـەم قۆناغـە (عـەلی حەسـەن مەجیـد و سـوڵتان هاشم) هاتن بۆ سەیری ئەو گیراوانەی کە لە قادر کەرەم کۆکرابوونەوە[٢٣].

**قۆناغی چوارەمی ئەنفال /لە ٣ / ٥ تا ١٥/ ٥ / ١٩٨٨:**

ئـەنفالی چـوار بۆسـەر ناوچـەکانی دۆڵـی زێـی بچـووك و دەشـتی کۆیـە و ئاغجەلـەر و تەقتـەق و شـوان بـوو. ئـەنفالی چـوار لـە رۆژی ١٩٨٨/٥/٣ بـە کیمیابارانکردنی خەستی گوندی گۆپتەپە و عەسکەری سەر بە ناحیـەی ئاغجەلـەر دەسـتی پێکـرد، ئـەو بۆمبارانـە کیمیاوییـە بـووە هـۆی کوشـتنی ١٥٤ کـەس و بریندار بوونی سەدان کەسی دیکە. سوپا لە رۆژی ٥/١٥ سەرجەم گونـدەکانی ئـەم ناوچەیەی رووخاند و ئەم قۆناغەی ئەنفالیش کۆتایی هات [٢٤].

**قۆناغی پێنجەم و شەشەم و حەوتەمی ئەنفال**
**لە ١٥ / ٥ تـا ٢٦ / ٨ / ١٩٨٨:**

قۆناغەکانی (پێنجەم و شەشەم و حەوتەم)ی ئەنفال، بۆسەر پانتـایی نێـوان چیاکانی (شەقڵاوە و رەوانـدوز) بـوو، لـە رۆژی ١٥ی مـایس دەسـتی پێکـرد، ئـەم پەلامارەش بەهاوکاری فەرمانـدەی فەیلـەقی (٥) بـوو، هـەروەها سەرپەرشـتیاری ئـەم قۆناغـەی ئـەنفال (یـونس محمـد زەرب) بـوو، سـەرەتای ئـەم پـەلامارەش هەروەکو سەرجەم پەلامارەکانی دی رژێـم بـە هێرشـی کیمیـاوی دەسـتی پێکـرد، رۆژی ١٥ / ٥ / ١٩٨٨ دوا رۆژی رەمەزان بوو خەڵکی خۆیان بـۆ جـەژنی رەمـەزان ئامـادە کـرد بـوو، چـەند فرۆکەیـەك کەوتنـە کیمیابـارانکردنی گونـدەکانی (وەرە، عەلی یاوا، سماقولی، نازەنین) لەم پەلامارەدا لە گوندی وەرە (٣٦) کەس شەهید بوون (١٧) پیاو و (١٩) ئافرەت [٢٥].

**قۆناغی هەشتەم و کۆتایی ئەنفال لە ٢٦ / ٨ تـا ٦ / ٩ / ١٩٨٨:**

سنووری پـەلاماری قۆنـاغی هەشـتی ئـەنفال بـریتی بـوو لـە: دهـۆك، زاخـۆ، باتوفە، کانی ماسێ، زێوە، دێرەلوك، ئەترووش و زاوێتە. لەدوای وەستانی شـەڕی نێوان عێـراق ئێـران لـە ١٩٨٨/٨/٨ سـوپای عێـراق تـەواوی هێزەکـانی لـە ناوچـە سنوورییەکان کشاندەوە بۆ بەرەکانی ئـەنفال، کـە لـەو کاتـەدا ٧ قۆنـاغی ئـەنفال کۆتایی هاتبوو تەنها قۆناغی هەشتەمی ئەنفال مابوو، قۆناغی هەشـتەمی شـاڵاوی ئەنفال بۆسەر دەڤەری بادینان و ناوچەکانی سەر سنووری تورکیا بوو. سـەرەتای هێرشەکەش بۆ چاوترساندنی خەڵکەکە بە کیمیابـارانکردن دەسـتی پێکـرد، پـاش کیمیابـارانێکی خەسـت رژێـم هێرشـی زەمـینی لـە رۆژی ٢٨ / ٨ / ١٩٨٨ دەسـتی پێکرد، ئەم شاڵاوە لە رۆژئاواوە لە زاخـۆوە تـا ئامێـدی درێـژبووەوە لـە باشـوورو رۆژهەڵاتیشەوە شێخان و ئاکرێی گرتـەوە . پـاش رووخـانی سـەرجەم گونـدەکانی ئـەم ناوچـەیە لـە رۆژی ٦ / ١٩٨٨/٩ خاتمـەی ئـەنفال راگەیـەنرا و هـەر بـەو بۆنەیەشەوە لێبووردنی گشتی راگەیەنرا [٢٦].

## بەشی دووەم
## لێکەوتەی سیاسی ئەنفال لەنێو رۆمانەکەدا :

لەنێو رۆمانەکەدا، رۆماننووس پرۆسەی ئەنفال بەدەرەنجامی ئەقڵی پێکهاتەیەکی دیاریکراوی دەسەڵاتی بەعس و تێڕوانێکی سیاسی و شێوەیەکی دیاریکراوی ئۆرگانیزەی کۆمەڵگە و پەیوەندی نێوان دەسەڵاتی بەعس و کۆمەڵگەی کوردی دەبینێ ، ئەو دەسەڵاتەی لەپشتی پرۆسەی ئەنفالەوە بوو، هێزێکە خاپوورکردن لەپێکهاتەیدایە، بەبێ ئەوەی شوناسی ئەو شوێنەی وێران دەکرێت، رۆڵێکی ئەوتۆی هەبێت لە دەستنیشانکردنی بنەما و شوناسی ئەو دەسەڵاتە . کورد وەکو نەتەوەیەك لەدوای ئەنفالەوە توانی لەپێشتر زیندووتر بکەوێتە سەر قاچەکانی و سەربڵندانە بەرانبەر بە گەلانی دنیا و نەیارەکانی بوەستێتەوە، ئەگەرچی پەنابردن بۆ دۆستەکانی لە دنیادا بۆ بەدەنگەوە هاتنی، ئەو خامۆشییە ترسناکەیە، کە لەپشتییەوە هاواری گەلێکە، بە زوڵملێکراو ناسێنراوە و قوربانیدان بەشێکە لە ناسنامەیان، ئەگەرچی لەم نێوەندەدا هاواری کورد، کرووزانەوەیەکی زۆر تەنیا و ئاوازێکی هێندە خەمبار و بێهوودەیە ، لە بەدەستهێنانی کەمترین خەونەکانیدا ، هەموو ئامرازەکانی خۆناسینی پشتگوێ دەخرێت و تەنیا ئامرازی کرووزانەوە و هەڵخستنی تەرمەکانی نەبێت، کورد هێندە لە خۆتەنیایی و بێدەنگی دۆستەکانی دەترسێت، کە بچووکترین دەنگ هەڵبڕینیان هەناسەی ژیانەوەی پێدەبەخشێت.

رۆمانی (فرمێسکی بەفر)، یەکێکە لەو هەوڵە ئەدەبییانەی، تراژیدیایەکی مرۆڤایەتی لە سەردەمێکی مێژوویی، کە سەردەمی مۆدێرنەیە، وێنا کردووە . عەبدولقادر سەعید ئەو نووسەرەیە ئەزموونێکی دوورودرێژ و سەلیقەیەکی جوانی لە بواری نووسینی رۆماندا هەیە، ئەم رۆمانە باس لەسەر زەوین و جوگرافیایەك دەکات، ئەنفال سووتماکی کردووە، لەو سەردەمەدا شانۆی گەورەترین تاوان بووە بەرانبەر مرۆڤایەتی، خۆی ژیاوی سەردەمەکەیە و پێویستی بەوە نەبووە بۆ نووسینەوەی رۆمانەکەی بەدوای بەڵگە و سەرچاوەی مێژووییدا بگەڕێت. (فرمێسکی بەفر) رۆمانێکە بەقەبارە مامناوەندییە، بەڵام ناوەرۆکێکی گەورەی هەیە، ناوەرۆکی ئەم رۆمانە لە کردەی ئەنفال و ژاربارانکردن دەدوێت، ئەم

کارەساتە لەمێژووی نەتەوەی کورددا هێندە بەسۆیە، کە زۆر ئەستەمە هەموو وردەکارییەکانی لە دووتوێی ڕۆمانێکدا کۆبکرێتەوە، کەچی ڕۆماننووس لە ڕۆمانی فرمێسکی بەفردا هەندێك لە وردەکارییەکانی پرۆسەی ئەنفالی بەشێوەیەکی جوان لە دووتوێی ڕۆمانەکەیدا وێنە کردووە، لە خوێندنەوەیدا بەبێ ئەوەی خوێنەر هەست بەبێزاری بکات، بەمەش نووسەر هیچ رستە و ئاماژەیەکی بەبێ مەبەست نەنووسیوە، هەوڵیداوە زۆرترین ئاماژەو مەبەست نەك هەر لە نێو خودی رستەکاندا چڕ بکاتەوە، بەڵکو سەرجەمی ئەو ڕەگەزانەی کە بنیادی دەقەکە پێکدێنن، خاڵی نەبن لەو ئاماژانەی کە مەبەستێکی گەورەو دیاریکراو کورت دەکەنەوە. ڕۆماننووس لەنێو ڕۆمانەکەیدا باسی کەسێك دەکات بەناوی (عەلی)، کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکەیە، ئەم چیرۆکە بوونێکی واقیعی هەیە، نووسەر تێکەڵی فەنتازیا و خەیاڵی نووسینی خۆی کردووە، لە دووتوێی ڕۆمانێکدا بەناوی (فرمێسکی بەفر)، ئامادەی کردووە، ئەم کوڕە بەمنداڵی دوای پرۆسەی ئەنفال و ژاربارانکردنی ناوچەکەیان لەدایك و کەسوکارەکەیان دادەبڕێت، دواتر وەکو چەندین منداڵی تری ناوچەکەیان لەلایەن خانەوادەیەکی ئەودیو سنووری وڵاتەکەیان ( ئێران _ ئەسفەهان) بەخێو دەکرێت، تا تەمەنی دەگاتە ئاستێك بتوانێ دایك و باوکی راستەقینەی بناسێتەوە، بەمەش دەکەوێتە سۆراغکردن و بەدوادا گەڕانیان، سەرەنجام ئەوەی بۆ روون دەبێتەوە ئەو دایکەی ئێستا بەخێوی دەکات، کە ناوی (هاجەر)ە، دایکی راستەقینەی ئەو نییە، بەڵام ئەوەندەی خۆشەویستی پێداوە بووەتە شوێنگرەوەی دایکی، بۆیە عەلی لە ڕێی خەمی گەڕان بەشوێن دایك و حەزی ئاشنابوونەوە، بەو بوونەوەرەی کە مرۆڤ لەحزووریدا دەگەڕێتەوە بۆ منالی، دەکەوێتە پرسین ، بەمەش ڕۆماننووس لەگەڵ کارەکتەری سەرەکی (عەلی) سەفەرمان پێدەکات، بەلام سەفەری سەرهەڵگرتن نییە، سەفەری گەڕانەوەو گەڕانە بە شوێن ئولفەتێکی ونبوودا، عەلی پاڵەوانێکی ئەفسانەیی نییە، ئەگەرچی سەربوردەیەکی راستینەیە و باسە لە ڕۆحی سەردەمێکی کوردییانە، لە هەمان کاتدا گەڕانەوەی روخسارێکی نوێیە، روخساری ئەو گەنجەی پاش ئەوەی جەللادی بەعس نەیتوانی بیکاتە قوربانی، دوور دوور فڕێی دایە دەرەوەی پانتاییەکانی خۆی، سەفەری عەلی بەدیوێکی تردا سەفەری

بەجێهێشتنی پانتاییەکانی جەللاد و دەستبەردانە لە بوون بەقوربانی ، چونکە بەعس نەیدەویست کەسی دیکە جگە لە قوربانی لەتەنیشتیەوە بژی [٢٧]. لە بەشێکی دیکەی ڕۆمانەکەیدا ڕۆماننووس وێنەی ساتەوەختێکی تێفکرین لە ژیان و مردنمان بۆ وێنا دەکات، ئەو مردنەی هێزێك و ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی بۆ بەئەنجام گەیاندنی مەرامە سیاسییەکانی هەزارەها خەڵکی بێ تاوانی ژێرگڵ کرد، کە کاتێك لەکردەی ئەنفال هەزارەها خەڵك بەزۆر کۆکرانەوە و لەچاوەڕێی مەرگدا بوون، بەمەش ڕۆماننووس لەڕێگای مردنی هاجەری دایکی عەلی ئەو وەسفەمان بۆ دەکات، لەوێوە پەیوەندی و تێڕامانێك لەنێوان دوو شێوازی مردن وێنا دەکات، مردنێك بەقەدەرێکی ئیلاهی و مردنێکی تر بەقەدەری کوردبوون و بەبڕیارێکی سیاسی جێبەجێ کراوە. ژیان بۆ خۆی کۆمەڵێك قەدەری هەیە، بەهەمان شێوە مردنیش بەشێکە لەو قەدەرە، مردن کە هات هەموو وێناکانی قەدەر دەخاتە دەرەوەی بیرکردنەوە و تێڕامانەوە، مردن سەرداری هەموو تێڕامان و پێشبینییەکانی نێو بۆتەی ژیانە، بەمەش مردن لەنێو هەنگاوەکانی ژیان وەك پاڵەوانێکی نادیار ترسێکی قووڵی لەناخی هەر یەکێکماندا جێهێشتووە، هەرچەندە مردن وەك چەمکێکی دیار و ئامادە هاوشێوەی ڕۆح، بوونێکی نەمیتافیزیکی و نەماددی هەیە، واتە مردن و روح پەیوەندییان بە شوێن و کاتەوە نییە، مردن تا ئەو شوێن و کاتە هەیە، کە ژیان هەیە، چونکە مردن دیوە شاراوەکەی ژیانە و لە پەیوەندییەکی بەهێزدان، بۆدروستکردنی وێنەی مردنی هەزارەها کەس لە کردەیەکی سیاسی بەناو ئەنفال، ڕۆماننووس باسی ساتەوەختی مردنی دایکە هاجەر دەکات، ئەو دایکەی دوای کارەساتەکان باوەش و شوێنی لەخۆگری عەلی بووە، بۆیە کاتێك تەرمی هاجەر بۆ گۆڕستانەکە بەڕێدەکەن لەوێوە عەلی دەکەوێتە بیرکردنەوەیەکی قووڵ، کە تێیدا وێنەیەکی ڕاستەقینەی نێو گۆڕستانەکەمان نیشاندەدات، بەشێوەیەك بوونێکی ڕیالیستی و هەقیقی وەکو خۆی نواندووە، عەلی ئەو ساتەی دایکە هاجەری شۆڕی نێو گۆڕەکەی دەکەن، لەو ساتەوە تووشی داچڵەکین و داخورپینی دڵ و هۆشی دەبێت، ((ئاگرێك لە ناخمدا هەڵایسابوو نێڵە نێڵ دەسووتا، هەندێ لە هاوڕێکانم دەستیان دەخستە سەرشانم و هەندێکی دیکەیان لەبەر بێهێزیم لەپشتەوە بەهەردوو دەستیان کەمەریان

دەگرتم))[٢٨]، دواتر هاوشێوەی لێکەوتەیەکی دیکەی ئەنفال، رۆماننووس لەسەر وەسفکردنی گۆڕستانەکە بەردەوام دەبێت، بەشێوەیەك مردنی ئەو هەموو خەڵکەی نێو گۆڕستانەکە بەشێوازێکی سەرنجراکێش وێناکردووە و هاوشێوەی ژیان نرخاندوویەتی، ((ئەگەرچی ئەوێ گۆڕستانێکی بێدەنگ و هێمن بوو، بەلاّم بەوەی ژیان بەجۆرێکی تر ئاوەدان بوو، هەستت دەکرد ژیان بەگشت جوانییەکانییەوە دووبارە دەبێتەوە، وەلێ بەشێوەیەکی جیاوازتر))[٢٩] رۆماننووس لە وێناکردنی مردنی دایکی عەلیدا مەبەستییەتی بەرجەستەی رۆڵی کەسایەتییەك بکات، کە نایەوێت بێهوودە و لەخۆڕا بمرێت، بەڵکو مەرامیان لە مەرگی خۆیان دروستکردنی نموونەی بالاّیە بۆ دوای خۆیان، خوڵقاندنی چەشنێکە لە شێوەیەکی بالاّ، تا ئەوانی تر چاوی لێبکەن، ئەو چەشنە مرۆڤانە نایانەوێ پاش خۆیان بەتەنها لاشەیەکی مردوو و خوێنێکی رژاو و تەرمێکی نێژراو بن، بەڵکو لە خەمی کۆ یادەوەرییەکدان، کە بکرێن بەسیمبول و هەردەم وەکو شانازی نەتەوەیی سەیر بکرێن، (( باوکە لەبێمانایی ژیان وەرس بووم بەشوێن مانایەکی ترەوەم کە قایلم بکات من کێم؟ کوڕی کێ؟ خەڵکی کوێ؟ کام ماڵ؟ کام گەڕەگ؟ لە کوێوە هاتووم؟ بەدوای چیدا دەگەڕێم؟))[٣٠]، لەم پرسین و شوناس و خود دۆزینەوەی خۆیدا، عەلی پڕە لە پرسیار و گومان و توانای جیاوازی بیرکردنەوە و گوزارشتکردن، لێوانلێوە لە سۆز و هاوار و قیژە، بەلاّم دونیا لە ئاستی بێدەنگە و ناتوانێ لە ئاستیدا بپەیڤێت ، تراژیدیای عەلی لەو ساتەوە دەست پێدەکات، بوونەوەرێکی پرسیارکەرە لەنێو دونیایەکی بەتاڵ لە مانادا، بەدوای شوناس و شوێن و زێدی خۆیدا دەگەڕێت .

رۆمانی فرمێسکی بەفر، ئەنفال بەدیاردەیەکی کارەسات ئامێزی سیاسی سەر بە ساتەوەختێکی دیاریکراو دەزانێ ، بەمەش خوێندنەوە بۆ لێکەوتەکانی ئەنفال و شیکردنەوەی رەهەندە سیاسی و کۆمەلاّیەتییەکان، کە هەڵگری چەندین ئاماژەیە، بەتەنها پەیوەستی ناکات بە مێژووی نەتەوەیەکی ستەمکار یاخود کەلتوورێك بەڵکو بە بەشێك لەمێژووی هاوچەرخی کۆمەڵگای مۆدێرنە سەیری دەکات، بەمەش ئەنفالی هاوشانی هۆلۆکۆست و رەشە کوژییەکانی کۆمەڵگای مۆدێرنە کردووە، بەشێوەیەك هیچی کەمتر نییە لەو کارەساتانە. ئەم رۆمانە

بـەجیاوازتر لـە تـەواوی رۆمانـەکانی نێـو پانتـایی ئـەدەبی کـوردی، واتایـەکی جیـاوازتری بـەمانا و دەلالـەتی بـوون بەخشـیوە بەشـێوازێك مامەڵـەی لەگەڵـدا کردووە، خوێنەر هەست بەجۆرێك لە چنینی درامایەکی زیندوو دەکات، (( ئێمـەش مردووین تەنها بۆ ئەوە حەز دەکەین بژین کە ئەو چەند ساڵەی لەژیاندا مـاوین بـیر لـە بـیرەوەری ئـەوان بکەینەوە.....چـونکە برینـەکانمان بـۆنی بـاروت و بـۆنی پێکەنینە ژەهراوییەکانی دۆست و دوژمنـی لێـوە دێـت))[٣١]، رۆمـاننووس بـۆ ئـەم مەبەسـتە سـوودی لەمێـژوو وەرگرتـووەو گەڕاوەتـەوە بـۆ سـەردەمێك کـە تیایـدا ئەنفال و ژاربارانکردنی هەزارەها خەڵکی تێدا ئەنجامدراوە ، ئـەم مێـژووە دەیـەها چـیرۆکی بـەدوای خۆیـدا هێنـاوە بۆیـە رۆمـاننووس ویسـتوویەتی ئـەو مێـژووە بدۆزێتەوە و بۆ تاکی کوردی بەر دیدە بخات ، نەهاتووە هاوشێوەی مێـژوونووس خـەریکی نووسـینەوەی مێـژوو بێـت و بەشـێوەیەکی زنجیرەیـی بـەدوای رەوتـی رووداوەکانی مێژوودا شۆڕ بێتەوە، بەڵکو رۆمـاننووس شـوێن و کـاتی ئەنفالـەکانی کردۆتە خاڵی وەرچەرخانی مێژووی نەتەوەیەك و هەوڵیـداوە لـەدوای ئـەو کاتـەوە مانایـەکی تـر بـۆ بـوون بدۆزێتـەوە، مانایـەك تـەنیا لێکەوتـەکانی ئـەنفال درکـی پێبکەن، ((عەلی نەیزانی چەندێکە سەری لەناو لەپی دەستەکانی شاردبۆوە. بۆیـە ئازارێك لە روحیدا گەورە دەبوو کە نەیتوانی چیرۆکی ئەو کچە باڵابەرزە قژدرێژەی بەتەواوی گوێی لێبێت ......من لە سیانزە ماڵـەی هەڵەبجـەم، ئـەو سـیانزە ماڵـەی لانکـــەی سەربەســـتی ژنـــان و سەرچـــاوەی فەرهـــەنگی دامەزرانـــدنی یەکـــەم قوتابخانەیە))[٣٢]، رۆماننووس لەنێو رۆمانەکەیدا بەشێوازێك دەستەمۆی زەمـەنی کردووە و رۆچووەتە هەناوی مێژووەوە لـەوێوە سـەرەداوی ئـەم تاوانـەی بـەناوی ئەنفالەوە بەر دیدە خستووە ، بەمەش رۆماننووس تـەوزیفی خـەیاڵ و ئەندێشـەی خۆی کردووە لەکردەی نووسـینی رۆمانەکـە، بـەجۆرێك شـرۆڤە و لێکدانـەوەی بـۆ تـەواوی رووداوەکـان کـردووە، بەشـێوازێکی لـۆژیکی پەیوەنـدی نێـوان واقیـع و خەیاڵی رێکخستووە .

لـەنێو رۆمانەکـەدا کـردەی ئـەنفال بەلێکەوتـەی بابـەتێکی سیاسـی رژێمـە تۆتالیتارەکانی مێژووی دوێنێ و ئـەمڕۆ و ئاینـدە دەزانـی، بـۆ قڕکردنـی نـەژادی، وەك ئـامرازێکی جـەنگی بەرامبـەر بەنـەیارەکانیان بەکاریانـدێنن، کـە تیایـدا بـۆ

بەلاکەوتنی ململانێیەکان لەبەرامبەر دوژمنەکانیان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، بەمەش رۆماننووس وێنای ململانێیەکانی نێوان دوو نەتەوەی (عەرەب و فارس)ی، بۆ قڕکردنی کورد لەسەر جەستەی قوربانییەکانی تاکی کورد نەخشاندووە، ((شارەکەی ئێمە لەنێوان ئەو دوو بەرداشەدا دەنکە گوێزێکی گەورە بوو. هەریەکێکیان بەهەموو هێزیان چەکوشی سەرکەوتن و دۆڕانی خۆیان پیادەکێشا . شارەکەمان لەنێو زمانی عەرەبی و زمانی فارسیدا لە کەروێشکێکی ڕاکردووی بەر تفەنگی دوو ڕاوچی بێویژدان دەچوو))[٣٣]، بەمەش کردەی ئەنفال مێژوویەکی درێژو پاشخانێکی قێزەون و پڕ لە نەهامەتی و ماڵوێرانی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، لەم سۆنگەیەوە، کردەی ئەنفال بۆ نەتەوەی کورد خۆی لە پاشخانێکی سیاسی و بوغزاندنی نەتەوەیی نواندووە .

رۆماننووس هەوڵیداوە لە ڕێگای نووسینی رۆمانەکەیەوە ( فرمێسکی بەفر)، ئەم کارەساتە بکاتە بابەتێك، کە بەردەوام تاکی کوردی بیری لێبکاتەوە، کەوا ئەنفال وەکو مێژوو لە دوامانەوە نییە بەڵکو بەردەوام لەپێشماندایە، هەموو کات ئەم نەتەوەیە بۆ دوژمنەکانی نیشانەکراوە، بۆ قڕکردنیان، چونکە مەبەستی رۆماننووس وایە، کۆمەڵگای کوردی بەسیفەتی چەندین کارەسات، توانای یادەوەری لاوازکراوە، ((تەنانەت ئەو هەموو تیم و ڕێکخراوە ناوچەیی و جیهانییە کە تەنها کۆنگرە و کۆنفرانس و سیمینار لەبارەی ئەو چەکە کۆکوژانەوە دەگرن. هەر دوای تەواو بوونیان لەبەر دەرگای دەرەوەی هۆڵەکان پەشیمان دەبنەوە لە بڕیارەکانیان و یاداشتە بەنرخەکانی خۆیان دەخەنە تەنەکە خۆڵەکانەوە))[٣٤]، رۆماننووس کاری لەسەر قووڵکردنەوەی رەهەندە مرۆییەکان کردۆتەوە، بۆئەوەی بمێنێتەوە و هەمیشە زیندوو بێت، پێویستە ئەنفال و کردەی کوشتنی چەندین هاوڵاتی بێتاوان بەپرسێکی مرۆیی بکرێت و لەپانتایی نووسیندا گوزارشتی لێبکرێت، ببێتە داینەمۆ و بزوێنەری پێناسەکردنەوەی نەتەوەیەك بۆ ماف و ئازادییەکانی ژیانی، کە وەك مانا و ئاماژەیەك کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی لەسەر سیستمی سیاسی و کەلتووری و ئاینی تاکی کورد هەیە .

رۆماننووس پێیوایە لێکەوتە سیاسییەکانی ئەنفال کۆی پێکهاتەی بونیادی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونی تاکی، لە کۆمەڵگەی کوردی شڵەژاندووە، بۆیە

رۆمـاننووس لـەنێو رۆمانەکەیـدا ژیـانی مرۆڤـی کردۆتـە جەوهـەری شـتەکان و بەهایەکی راستەقینەی پێداوە، هەوڵیداوە بیکاتە دیاردەیەکی سەردەم و لە فەزای هۆشیاری و بیرکردنەوەی تاك بە تاکی کۆمەڵگەدا، بمێنێتەوە، (( گوێچکەمان پـڕ بوو لەدەنگی نامۆی وا هـەرگیز پـێش ئەوسـا بـەر گوێمـان نەکـەوتبوو، هەسـتمان دەکرد ئێستا دنیا دەبێ بەتۆفان شاخەکان دادەڕمێن . ڕێگاکـان کـوێر دەبنـەوە، ئاسمان دادەبەزێتە سەر زەوی))[٣٥] ، بۆ ئەم مەبەسـتەش کەرەسـتەکانی ئـەم بـە زیندوو راگرتنەش بریتییە لـەبیر هێنانـەوەی ئـەنفال و زیندەبەچـاڵکردنی چـەندین مرۆڤی بێتاوان ، کە ئەمانە بەبـەردەوام بـۆ زینـدوو راگرتنـی کارەسـاتەکە بکرێتـە سیمبولێك، کە توانایەکی راستەقینەی گوزارشت لەخۆکردنی هەیـە، بۆیـە نووسـەر (عەبدولقادر سەعید) مەبەستییەتی تراژیدیای ئەنفال، لە سـاتەوەختێکەوەیە، کـە تیایـدا ئـازار، دەنـگ و رەنگییـەتی، بکرێتـە هۆشـیارییەك و بکرێتـە گریانێـك بـۆ چارەنووسی نەتەوەیەك . نووسەر لەنێو رۆمانەکەیدا ئەنفالی بەجۆرێك نرخانـدووە، کەوا یادکردنەوەی ببێتە هەوێنی بەنرخکردنی مرۆڤە زیندووەکانی دوایی پرۆسـەی ئەنفال، هەرچەندە مـرۆڤ لـەم سـاتەوەختەدا خۆشەویسـتی خـۆی بـۆ مردووەکـان ئاشکرا دەکات ، بەڵام ئەبێ بکرێتە نەریتێك و پەرەی پێبدرێ .

ئەم رۆمانە ساتەوەختێك دەنووسێتەوە، کە مێژوو فەرامۆشی کردووە، بەڵام رۆماننووس ئەم مێژووە و ساتەوەختەی ئاوێزانی یەکتر کردووە و هەوڵیداوە دیوی دیکەی ئـەم مێـژووە، بەشـێواز و شـێوەیەکی دیکـە بخزێنێتـە نێـو کـۆ یـادەوەری مێـژووی مرۆڤایـەتی ، ئـەم رۆمانـە بـەڕوونی نهێنییـە شـاراوەکانی ئـەنفالی، وەك مێژوویەك لـە خـوێن و کوشـتنی چـەندین خـەڵکی بێتـاوانی نووسـیوەتەوە، ((لـە دوورەوە تارمایی مەرگت دەبینی بانگی دەکردین نـاوی یـەك بەیـەکمانی دەزانـی. دەستی دەهێنا بەسەرماندا و بۆنی دەکردین تا خۆشمان بووێت کەڵبـە و پشـکۆی چـاوە داگیرسـاوەکانی بـۆنی عـەتری سـێوی مـەرگی لێـدەهات.))[٣٦]، بۆیــە رۆماننووس بەرامبەر بە ئەنفال و سەرجەم کارەسـاتەکانی ئـەم نەتەوەیـە تووشـی تێڕامان و بیرکردنەوەیەکمان دەکات کەوا بە هەموو ئەگەرەکانی مێژووی خۆمانـدا بچـینەوە، جـارێکی تـر و بەشـێوازێکی دیکـە تێهەڵچـینەوە، رۆمـاننووس لـە چوارچێوەی خەیاڵ و بیرکردنەوەکانییەوە، لەنێو پانتایی رۆمانەکەیدا، توانیویەتی

مێژوویـەك بنووسـێتەوە، کـەوا سـەرجەم مێـژووی مرۆڤایـەتی بخاتـە بـەردەم لێپرسینەوە، ((بیرم کەوتەوە ئەو قورئانە پیرۆزەی لە باخەڵمدا بۆ سەلامەتی خۆم و خێزانەکەم هەڵمگرتبوو دەرمهێنا لاپـەڕەی سـورەتی یاسـینم کـردەوە پەنجـەم خستە سەر یەکـەم دێـری سـورەتەکە))[٣٧]، بەمـەش رەگوڕیشـەی کارەسـاتەکانی ژاربارانکردن و ئەنفال، بۆ مێژوویەکی دوورتر و ماسکەکانی مێژوو تووڕ هەڵدەدات و پەنجە دەخاتە سەر ئەو برینانەی بڕیاری سیاسی دروستی کردوون، کە تا کـورد مابێت خوێنیان لێ دەچۆڕێ .

### لێکەوتەی کۆمەڵایەتی ئەنفال :

دەرهاویشـتە و لێکەوتـەکانی ئـەنفال، خـۆی خزاندۆتـە نێـو رەهەنـدە سۆسۆلۆژییەکانی تاکی کورد و لەسەر شـێوەی ژیـانی چـەندین تـاکی ئـەم جڤاتـە کاریگەری نواندووە، بۆیە ئەم تاوانە لە دۆخـی کۆمەڵایـەتی تـاکی کوردا بـەقووڵی کارەساتەکە جێکەوتەی خۆی دەرخستووە، (( ڕەنگی سەوزی بـەهاری شـار گـۆڕا بەڕەنگی مـردن ، بـا جۆلانـەی بـە پەنجـەرەی کـراوەو دەرگـای والاّ و لـێکترازاوی ماڵەکان دەکرد، دەستی تێکەڵی پیاو و ژنـەکان لێـك جودابوونـەوە))[٣٨]، کـردەی ئەنفال جگە لە چەندین دەرهاویشتەی کۆمەڵایەتی، هەوڵێکە بۆ گۆڕینی جوگرافیـا و شیرازە تێکدانی خێزانی کـورد، بەشـێوەیەك پێکهاتـەی نەتـەوەیی شـێواندووە، ئەمەش ئەو راستییەیە رۆماننووس لەسەر زاری عـەلی درکاندوویـەتی، (( کـێ نـاڵێ ئەوەی منی گەیاندە بیمارسـتانی ئـەو شـارەی چـەند فرسـەخێ لـە ژەهرەباکـەوە دوور بـوو، منـی لـەنوای ماڵـە جووتیـارێ نەدۆزیوەتـەوە. ئـەی کـێ نـاڵێ دوای بەجێمانم لەمردن، دەڵە گورگێك یان گیاندارێك نەیپاراستووم کاتێك گوێی لـەگریانم بووە و هەسـتی بەتەنیاییەکـەی مـن کـردووە))[٣٩]، بەمـەش رۆمـاننووس کـردەی ئـەنفالی بـەمیراتێکی گـەورەی نەتەوەیـەکی مـەزڵووم زانیـوە، بەمـەش لێکەوتـەی کۆمەڵایەتی ئـەنفال، لێوانلێـوە لـە قـەیرانی کۆمەڵایـەتی و خێزانـی و دامـاوکردنی زۆرێك لە ژن و منداڵ و پەککەوتەیە .

نووسەر لەنێو رۆمانەکەیدا، بەپێویسـتی زانیـوە لـەم کارەسـاتە بـەدواوە لـە کۆمەڵگەی کوردیدا، بە قووڵی قسە لەسەر جوانییـەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی تـاکی کورد بکرێت و لەوێوە تیشك بخرێتە سەر لێکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەنفال و ئـەو

کارەساتەی بەر دیدەیان کاڵ بکرێتەوە و لە هەوڵی سەرلەنوێ دارشتنەوەی ژیانێکی نوێدا بن، عەلی لەدوای شادبوونەوەی بەخانەوادەکەیان، دەستی بەنیگارکێشان کردەوە، کە پێشتر ئەم ئارەزووە و بەهرەیەی لە دایکە هاجەرەوە فێر ببوو، بەشێوازێك تابلۆکانی دەکێشا کە گوزارشتی لە ژیانەوە و سەرلەنوێ دەستپێکردنی ژیانەوە بوو، تەنانەت خەڵکیش ئەم داوایەیان لێی دەکرد، ((دەیانگوت ئەم هونەرمەندە دەبێ بە شوێن گێڕانەوەی ژیانەوە بێت لەم شارەدا))[٤٠]، چونکە لەنێو کۆمەڵگەی کوریدا هیچ وشەیەك هێندەی وشەی ئەنفال تاکی ئەم جڤاتەی سەرگێژ نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەژێر وشەی ئەنفال، سەدان کەسی فاشست و دیکتاتۆر رەوایەتی خۆیانیان پێ مەیسەر کردووە، لەبەرانبەریشدا هەزاران مرۆڤیان پێ کوشتووە، بۆیە رۆماننووس پێیوایە زاراوەی ئەنفال لە کۆ یادەوەری تاکی کورد، زاراوەیەکی ئەفسووناوییە کە لە توانایدایە هەزاران مرۆڤ بێدەنگ بکات و ژیانیان بکاتە نادڵنیاییەکی ئەوتۆ کە هەرگیز ترووسکایی ژیان بە هزریان گوزەر نەکات ، بۆیە زۆر و بێشومارن ئەو مرۆڤانەی لەژێر کاریگەری زاراوەی ئەنفال بە نا ئاسوودەیی دەژین و بەدنیایەك بێهوودەییشەوە دەخەون .

رۆماننووس پێیوایە کورد تەنیا لاشەی کوژراوەکانی و خوێنی رژاوی کردۆتە بەڵگەیەك بۆ دنیا تا بەدوای چارەسەری ناسنامەییدا بۆی بگەڕێن. ئەگەرچی قوربانی بوونەوەرێکی بێ شوناسە، نەپێویست دەکات کەسایەتی خۆی بناسێنێ و نەکەسیش داوای ناسینی لێدەکات، بەمەش دەسەڵاتی زاڵی سەردەمی ئەنفال ، ئەنفالی کردبووە ناوێك بۆ بەخشینی مانایەك بۆ بانگکردنی نەتەوەیەك بۆ مردن و لێسەندنەوەی بوونە کۆمەڵایەتییەکەی، ئەمەش سڕینەوەیەتی لە ژیان و فڕێدانییەتی بۆ سنووری دەرەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی . دەسەڵاتی بەعس بەبێ ویستی تاکی کورد شوناسێکی پێ بەخشیوە، کە ئەویش بە ئەهریمەن بوونە لەزێد و نیشتمانی خۆی و مەرگی بۆ دیاری کردبوو، بۆیە نووسەر لە ئاماژەیەکیدا لەنێو رۆمانەکەی باسی ساتەوەختی مردنی بە کۆمەڵ دەکات، ((چەندین منالی نابالق بەسەر ئاوەکەوە رەش دەچوونەوە و پاڵ کەوتبوون چەندین ساوای ناو بێشکە بەسەر شەپۆڵەکاندا دەهاتنە خوارەوە))[٤١]، تیایدا چرکە ساتێکە منداڵ و پیر و

یەککەوتە کۆتایی بەگرێبەستی ژیانیان دێت و پێکڕا لـە کەرنـەڤالێکی گەلەکۆییـدا بڕیـاری لـەناوبردنیان بـۆ دەردەکرێـت، هەرچـەندە کـورد لەمێـژە ئەمـەی بەسـەر زارانەوە گرتووە (الحشر مع الناس عید)، لێرەدا تـاکی کـورد ئاسـتی بـێ مروەتـی بەرامبەر بەمردن و ترس لەمردن تێکەڵ بەیەکتری دەبـن و سـنوورەکانی نێوانیـان وندەبێت، هەرچەندە رۆماننووس پێیوایە ناتوانین ناونانی ئـەنفال لـە ئایـدۆلۆژیای بەعس و دەسەلاتی ئەو هێزە وەکو دوو بابەتی سەربەخۆ خوێندنەوەی بۆ بکرێت، بـەڵکو هەریەکـەو لـە ئـەویتردا بەشـدارە لـە بەرهەمهێنانەوەیـدا، ((یەکـەم تەقـەی داگیرکـەر نـرا بەسـنگی قوربانیـدەرانی خاکـەوە، هەرلـەوێ یەکـەم فیشـەکی ئازادیخوازان نرا بـەقوفڵی سـەردەرگا ئەڵقـە ڕێزکراوەکـانی سـەر ئازادییـەوە))[٤٢]، بۆیە کاتێك باس لە ئەنفال دەکرێت، روخساری دەسەلاتی بەعس دەدوێت، چونکە بـەرەنجامی هەڵسوکەوتە سیاسییەکانیانن، لـەم نێوەندەشـدا تـاکی کـورد وەکـو بوونەوەرێکی ئەنفال بەسەر داسەپاو چەقی ئەم هاوکێشـەیە پێکـدێنێ، ئەگەرچـی دەسەلاتی بەعس دەبێتـە خولقێنـەری کـردەی ئـەنفال و نەتـەوەی کـورد بووەتـە خاڵی جێبەجێکردنی مەرامە گڵاوەکانیان .

رۆماننووس لە کارەکتەری عەلیدا پرسـیارکردن و گـەڕان بـەدوای ناسـنامەی (خود)ی کردۆتە کێشەیەك کـە بـەردەوام وێڵـە بەدوایـدا و لـە هەنگاوەکانیـدا سـڵ ناکاتەوە، پرسیارێك لەدوایی کارەساتێکەوە دێتە بوون، تێفکرینی عەلی لەبەرانبەر دۆزینەوەی نیشتمان و دایکیدا، ئـەو پرسـەیە لـەناو کـۆی یـادەوەری و شکسـت و خەون و ئومێدەکانییەوە، دەیگەڕێنێتەوە بۆ نێو ئەزموونێك، کە بە نووسـینکردنی تراژیدیایە، یادەوەری خودێك لەنێو کۆی یـادەوەری چـەندین سـاڵەی لەمەوبەریـدا دەتوێتـــەوە، پرســـیار و خـــەمی ســـەرەکی عـــەلی پرســـیارکردنە لـــە دایکـــی و نیشتمانەکەی، ئەمەش ئەزموونی عەشقە بـۆ خـود، ((حـەزی دەکـرد مـاڵ بـەماڵ، کۆڵان بە کۆڵانی شـاری ئەسـفەهان تـەی بکـات، لـە دەرگـای هـەموو ماڵێـك بـدات هەواڵی ژیانی ئەوانە بزانێـت پەناهەنـدە و سـەرگەردان و بـێ کـەس لـە شـارەکەدا دەژیـن))[٤٣] لێـرەدا عـەلی گـەڕان بـەدوای دۆزینـەوەی ناسـنامەی خـۆی، بووەتـە رووبەرێك لەدووتوێی تراژیدیایەك نەخشێنراوە، لە داهاتووی نیگەرانە و لـە پرسـین و شوناسی خۆی زارەترەك بووە، بۆیە داهاتوو بۆ عەلی بڕوا نەبوونە، نادڵنیاییـیـە،

بەمەش رۆماننووس هاتووە ئەو نادڵنیاییە و یادەوەرییە بەر دیدە دەخات و دەینووسێتەوە، دەیکاتە سەرلەبەری هەوێنی چیرۆکی ئەنفال، چیرۆکێك لە ئەفسوونە سەیرەکانی عەشقەوە دەست پێدەکات، کە ئەمەش دروستکردنی هێزێکە لە جوانی، هەرچەندە لەنێو رۆمانەکەدا وێرانبوونی جوانییەکان لەکردەی نووسیندا مەنەفێست بووە، ((ئەو حەزی دەکرد دوو باڵی لێ پەیدابێت و بچێتە قەراغ شاری ئەسفەهان، پڕ بەدڵ بگری بۆ دووری دایکە هاجەری و چارەنووسی نادیاری خۆی))[٤٤] ، نووسەر لەنێو رۆمانەکەیدا لە هەوڵی گەڕانەوەیە بۆ سەرەتا، تا بتوانێ خوێنی عەشق و خوێنی ئەنفال ئاوێزانی یەکتر بکات و بیکاتە هۆیەك بۆ هێزی بەردەوامیدان بۆ نەتەوەیەك، بۆئەوەی ببێ بەخاوەنی ناسنامەیەك نەك لە کارەساتەکان بەڵکو لە خۆشەویستی و مرۆڤدۆستیشدا لە ریزی پێشەوە بێت، ئەمە وای لێدەکات سەرلەنوێ دەست پێبکاتەوە لە رەوتی مێژووی مرۆڤایەتیدا هاوشانی میللەتانی تر لەهەنگاو هەڵهێنانیدا دوا نەکەوێت . عەلی وێڵە بەدوای ئەو پرسیارانەی کەوا ناسنامە و بوونی بسەلمێنێ، بوونێك شکۆیەکی شەرەفمەندانەی پێببەخشێ، عەلی دوای کارەساتەکە لە تەواوی مێژووی مرۆڤایەتی دەکەوێتە گومان، بەشێوەیەك پێیوایە ئەم سزایە سیزیفییە و هاوشێوەی چیرۆکی ئۆدیبی پاشایە، بەمەش پرسیار ئاراستەی نادیار دەکات و پێیوایە بەوەڵامدانەوەی سوکنایی دڵی دێت و ئارامییەکی پێدەبەخشێت، (( باوکە من چیرۆکی ئۆدیبی پاشام خوێندۆتەوە و عەزابی سیزیفم بیستووە خەریکە بەناخی زەویدا رۆدەچم، باوکە بمپارێزە لەدووبارەکردنەوەی گوناهە گەورەکانی مێژوو، کە روویانداوە یان رەنگە روودەن ))[٤٥]، لێرەدا نووسەر دەمانخاتە بەردەم پرسیارێك کەوا ناسینەوەی کەسێك لە کردەی ئەنفالدا، پرسین و دۆزینەوەی نەتەوەیەکە، بۆیە نووسەریش بەهەمان ئاراستە لەنێو رۆمانەکەیدا ئاماژەی پێداوە، دەیەوێت بۆمان روونبکاتەوە، دەشێ هەموو پێکهاتە ناماترلییەکان بۆ لێکدانەوەی واقیعی ژیانی عەلی بەکاربهێنین، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرفراوانکردنی مەودای لێکدانەوەمان بۆ پێکهاتە نەستی و ئەندێشەییەکانی ئەم کارەساتە، نووسەر لەبری ئەوەی واقعێك بخاتە روو یان مرۆڤێك بەقسە بێنێ، بەڵکو کارەساتەکە خۆی دێتە گۆ .

لەنێو ڕۆمانەکەدا، یەکێك لە لێکەوتەکانی ئەنفال بریتییە لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر شوێنەکاندا هاتووە، کاتێك عەلی لەدوای هاتنەوەی بۆ باوەشی نیشتمانی، دەکەوێتە بیرکردنەوە و لێکدانەوەیەکی قووڵ، چونکە شوێن مۆرکێکی فیکری و مێژوویی و دەروونی هەیە، بەڵام گەوهەری مۆرکەکان گەڕانەوەی نهێنییەکانی خودە، کە لەناخەوە ئەم هەستە ئازارێکی قورسە بۆ لەبیرکردنەوەی ژیانێك بەو هەموو ناخۆشی و دەردەوە، کاتێك وێنەی خۆی دوور لە نهێنییەکان و دوور لە سۆزی دایکایەتی دەبینێتەوە، ((سنووری نێوان شاری ژەهر خواردوو تا شارە چاو بەگریانەکانی دەوروبەر، بە ڕەوە جاشی گەورە گەورە و ڕیزە سەربازی جەستە بەفیشەك داپۆشرابوو لەودیو تەلی دڕکاوییەوە چاوەڕوانی ئێمە بوون))[٤٦]، هەروەکو چۆن دەبینین کرۆکی بوون و شوناسی هەر تاکێك نزیکبوونەوەیە لە هەست و سۆزی خود، نزیکبوونەوە و هیواخواستن بۆ هاوبەشی کردن لە نهێنییەکانی بوون و هیواخواستن بۆ گەڕانەوەی شکۆمەندییەکانی خود، مەبەستی گەڕانەوەی عەلی بۆ شوێن و زێدی خۆی، خۆبەدەستەوەدانە بەو چارەنووسەی، کە کۆتایی گەڕان و پرسیارکردنە لە شوناس و ناسنامەی خۆی، بەمەش زێد و خاك بەقەد ئەوەی دەرفەتێکە بۆ کرانەوە لەبەردەم گەڕانی خود بەدوای خۆی وەکو شوێنێکی پڕ ئارامی و حەسانەوە، چونکە ئەوە عەلییە بەدوای شوێنێك و سەر زەمینێك دەگەڕێ، بۆیە مرۆڤ وەکو بەهایەکی دەروونی ترسی لەشوێن هەیە، ئەو ترسەش بەرجەستەبووی تەنیایی خۆیەتی لە دنیایەکی فراواندا، ئاشتبوونەوەی عەلی لەگەڵ زێد و نیشتمانەکەی ساڕێژکردنی برین و خەم و ناسۆرییەکانیەتی و بەردەوامیدانە بەمانەوەی، دواتر گفتوگۆی خودە لەگەڵ ناخی خۆیدا، کە شوێن لای ئەو پانتاییەکە بۆ بەنهێنیکردنی بوون، چونکە ئەو دەیزانی گەڕانەوەی بۆ باوەشی دایکی ڕاستەقینەی خۆبەدەستەوەدانییەتی بۆ قەدەرێکی دووبارە لە کارەسات، بۆ عەلی زۆربەی کات چاوەڕوانییەکان لەدوای مردنی دایکە هاجەری، جۆرێك لە ژیانی بێهوودەییە، ((عەلی سەری دەخستە نێو هەردوو لەپی دەستەکانیەوە هۆن هۆن دەگریا و دەیگوت: نا هیچم بیرناکەوێتەوە، جگە لە سۆزی دایکە هاجەرم نەبێت، تەنها ئەوم بیر دێتەوە))[٤٧]، ئەم جۆرە چاوەڕوانییە لە ناهۆشیاری مرۆڤدا هێزی لەبیرکردن و چارەنووسی مردنی پێدەبەخشێ، مرۆڤ و

شوێن دوو کایەی یەك بەهان، هەریەکێکیان ژیان بەئەویتریان دەبەخشێ . ئەو ساتە وەختەی عەلی خۆی بۆ نمایشی ناسینەوەی خانەوادەکەیان ئامادە کردبوو، ئە و شوێن و کاتە سەرنجراکێشترین هەستیان بە عەلی بەخشیبوو، کاتێك دانیشتوان و خەڵکی حەسرەت دیدە، وێڵن بەدوای دۆزینەوە و ناسینەوەی رۆڵەکانیان، لە دواوەی خەڵکەکە ئافرەتێکی جوانپۆش لە وەسفکردنیدا دەڵێت: ((لە شوێنێکی کەمێك شاراوەو پەراوێزخراوی هۆڵەکەدا، ژنێکی بالآبەرزی قژدرێژی کراسێکی مۆدێرنی ئەوروپایی لەبەردابوو، سەرنجی عەلی راکێشا چونکە رێك لە تابلۆی هونەرمەندێکی جیهانی دەکرد))[٤٨]، لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە ئەم کارەساتە سەرباری خەمهەژێنییەکەی شێوەی کەرنەڤاڵێکی بەخۆوە دیوە، دانیشتوانی ناو هۆڵەکە تاسەی دۆزینەوەی بەشێك لە جەرگیان دەکەن، ئەم تاسەکردنە خوێنی چەندین منداڵ و لاوی لەخۆیدا هەڵگرتووە، بەتایبەت ((سیمای ئەو پیاوە ریش سپییە سەرنجی راکێشا، کە لەنێوان ریشە سپییە چڕەکەیدا فرمێسك وەك چۆڕاوگەی گوێسەبانە قورپینەکان دادەچۆڕا)) [٤٩]، ئەم وێنانە داچڵەکین و ململانێیەکی دەروونی بۆ عەلی دروست کردبوو، چونکە بەراوردکردنی چەندین وێنەی هاوشێوەی دوو شوێنی جیاواز (ئەسفەهان و کوردستان) بۆ عەلی تاڕادەیەك ئەستەمە، ئەو ساتەی عەلی لە ئەسفەهان ژیاوە، ژیانێکی بێ کێشە و خۆشی هەبووە، بەلآم لەم ساتەوەختەدا بینینی گریان و ئاپۆرەی خەڵك بۆ عەلی تووشی نیگەرانی کردووە، ((ئامادەبووانی ناو هۆڵەکە هەریەکەو بەشێوەیەکی جیا لەوەی تری دەڕوانی . بەچاو و دەم و برۆکانیان دەپەیڤین . بەئەندازەی ئارەزووە شاراوەکانی دەروونیان خۆیان دەبزواند و شوێنیان بە خۆیان نەدەگرت ))[٥٠]، شوێن و شوناس تواناکانی مرۆڤ وەگەڕدەخەن، شوێنێك ژیان و مردن لەخۆیدا وەدی بێنێت، بەمەش سروشت و هێزی جوانییەکانی شوێن جگە لە بەرجەستەکردنی تواناکانی مرۆڤ لە خولقاندنی فەنتازیا هەروەها خولقاندنی ئیرادە و توانا پێبەخشینیەتی، مرۆڤ هەر لە ئەزەلەوە خەمی مانەوە لە شوێن و قورتاربوون لە مردن و دۆزینەوەی دەریچەیەك بۆ بەردەوامیدانی ژیانی، لە ناخەوە تووشی تێڕامان و بیرکردنەوەی کردووە .

## ئەنجام

• نووسەر لەنێو رۆمانەکەیدا، وێنەی کارەساتی ئەنفالی تێکەڵ بە خەیاڵ و فەنتازیای خۆی کردووە، هەوڵیداوە، وێنەیەك بەرجەستە بکات گوزارشت لە گەورەیی کارەساتەکە بکات .

• نووسەر، کارەساتی ئەنفالی بە رەهەندی سیاسی دەسەڵاتی بەعسی زانیوە، بەمەش رقێکی لەمێژینەی ئەو دەسەڵاتەی بۆ قڕکردنی نەتەوەی کورد خستووتە بەرچاو.

• لێکەوتەی سیاسی ئەنفال، خۆی لە سووتماککردنی سەرزەوینی ناوچە کوردنشینەکان بینییەوە، نووسەر لەنێو رۆمانەکەیدا، زۆر بە روونی ئاماژەی بەو تێفکرینە سیاسییە کردووە، کە قورئانی کردۆتە ئامرازێك بۆ مەبەستەکانی خۆی .

• لە نێو رۆمانەکەیدا نووسەر وێنای کوشتن و هەتیوکردنی هەزارەها منداڵی بەرجەستە کردووە، کە بووەتە تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتیی نەتەوەیەك، بۆیە نووسەر ئەمەی بەمەستی کردەی ئەنفال زانیوە، تاوەکو کاریگەری لەسەر چەندین نەوەی دیکەی نەتەوەی کورد هەبێت .

## پەراوێزەکان:

(1) شورش رسول حاجی، انفال الکورد و **دولة العراق**، **مطبعة** شڤان، سلیمانی، ٢٠٠٥، ل٥٣.

(2) الامام العلامة محمد جمال الدین القاسمی، المسمي محاسن التاویل ،مجلد٥، ط١، دارالکتب العلمیة، بیروت، ١٩٩٧، ل٢٥٣.

(3) ئاسۆ حەسەن، لەدووڕیانی مەرگ و ژیاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٤.

(4) بورهان محمەدامین، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، چ١، لەبلاۆکراوەکانی کتێبخانەی رۆشەنبیر(لقی سلێمانی –هەولێر)، ٢٠٠٤، ل١٧٧.

(5) http://govarikoch.com/%28A%28geNMBTzJzgEkAAAAMThjOTkxZTctZTUwYy00YzljLTlkODYtYjY3YjQxYzAyNzhidJIQEPWbae9YStFNbHG8WaMooQo1%29%29/Detail.aspx?id=34&LinkID=8

(6) بورهان محمەدامین، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان ، چ١، لەبلاۆکراوەکانی کتێبخانەی رۆشەنبیر(لقی سلێمانی –هەولێر)،٢٠٠٤، ل ١٧٧.

(7) کەنعان مەکییە، دڵڕەقی و بێدەنگی ، وەرگێڕانی: حەمە رەشید، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٢٥٧ .

(8) مەریوان وریا قانع، ئەنفال و مۆدێرنە، گۆڤاری رەهەند، ژ٧، ١٩٩٩، ل٣٢.

(9) حەمە کاکەڕەش، بێدەنگی و کۆکوژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٣٠٣.

* میشیل عەفلەق، لە ٩ ی کانونی دووەمی ١٩١٠ لەخێزانێکی مەسیحی ئەرسەدۆکسی لە دیمەشق لەدایك بووە، بۆ خوێندنی زانکۆ چووەتە زانکۆی سۆربۆن، لەو ماوەیەدا دەستی بەکاری سیاسی کردووە، لەگەڵ سەلاحەددین بەیتار (یەکێتی قوتابیانی عەرەب)یان، دامەزراندووە، باوکی عەفلەق بەهۆی گەشتە زۆرەکانی و کاری بازرگانییەوە تێکەڵاوی پیاوانی هەموو پێڕەوەکان بووە، دوای گەڕانەوەی لە فەرەنسا باوکی ناردوویەتییە دوا ناوەندییەك لەگەڕەکی تۆمای مەسیحییەکان کە کاهینەکان بەڕێوەیان دەبرد، بەڵام عەفلەق بەبیرکردنەوەی دژ بەتایفەگەری، ژینگەی باوی ئەوێی بەهیچ شێوەیەك پێ لەبار نەبوو، بۆیە هەمیشە لەگەڵ مامۆستاکانی هاوەڵی لەکێشەدا بووە، لەساڵی ١٩٣٣، دەچێتە دواناوەندی (تجهیز) وانەی مێژوو دەڵێتەوە، تا ساڵی ١٩٤٢ وازی لەکاری مامۆستایەتی هێناوە و خۆی بۆ کاری حزبی بەعس تەرخانکردووە، لە ٢٣ حوزەیرانی ١٩٨٩ مردووە . بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:
https://ar.wikipedia.org/wiki/%D9%85%D9%8A%D8%B4%D9%8A%D9%84_%D8%B9%D9%81%D9%84%D9%82

([10]) رامیار محمود، بەعسیزم و سەرکوتکردنی ژیان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٣١–٣٢.
([11]) بدون اسم المؤلف، حزب البعث العربی الاشتراکي، ط٢، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ل ١١٩–١٢٠.
([12]) میشیل عفلق، **معرکة** المصیر الواحد، بیروت – لبنان، ١٩٧٥، ل ٤٣، یاخود سۆزان کەریم مستەفا، بەعسیزم و کورد، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٨٤.
([13]) دورییە عەونی، عەرەب و کورد – ناکۆکی یان تەبایی، وەرگێڕانی: سوارە قەلآدزێیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١١، ل ١٤٤.
([14]) فاروق رەفیق، ماڵێکی لێکترازاو و ویژدانێکی بیمار، چاپی دووەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٠٠ .
([15]) عەدالەت عومەر سالح، ئەنفال و ئافرەتی کورد، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٦٨.
([16]) د. ئەوان و. ئەندەرسن – د.خەلیل هـ. رەشیدیان، عێراق و بەردەوامی قەیرانی خۆرهەلآتی ناوەڕاست، وەرگێڕانی: فوئادی تاهیر سادق، چ١، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٧٥.
([17]) عەبدولکەریم هەڵەدنی، لە ئەنفالەوە بۆ ئەنفال، گۆڤاری رەهەند، ژ٧، ١٩٩٩، ل ١٢٨.
([18]) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عەلی مەحمود محەمەد، چەند لاپەڕەیەکی شاراوە لە مێژووی کۆمەڵکوژییەکان، چ١، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوک، ٢٠٠٦، ل ١٢٤ – ١٢٦ .
([19]) زوهێر کازم عەببود، دادگایی ئەنفال، وەرگێڕانی: محەمەد گۆمەیی ،چ١، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٦٩– ٧٠.
([20]) یوسف دزەیی، ئەنفال، کارەسات، ئەنجام و رەهەندەکانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٢٨ – ٣٠.
([21]) محەمەد رەئوف عبدالعزیز، ئەنفال و رەهەندە سۆسیۆلۆجییەکانی، چ١، چاپخانەی تیشک، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٤٢ – ٤٣.
([22]) یوسف دزەیی، ئەنفال، کارەسات، ئەنجام و رەهەندەکانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٩٢ – ٩٤.
([23]) عەدالەت عومەر سالح، ئەنفال و ئافرەتی کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٦٢ – ٦٩.
([24]) د. ئەحمەد شەریف عەلی، ئەنفال لە رۆمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٦٢ – ٦٤.
([25]) – شەمزین جیهانی، کورتەباسێك لەسەر ئەنفال، چ١، رۆژهەلآت، هەولێر، بەبێ ساڵی چاپ، ل٢٣.
([26]) عەدالەت عومەر سالح، ئەنفال و ئافرەتی کورد ، ل ٨٢–٨٥.

([27]) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر، چ١، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٢، ل١١.
([28]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣.
([29]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥.
([30]) عەبدولقادر سەعید ، فرمێسکی بەفر ل ٢٨–٢٩.
([31]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٨.
([32]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.
([33]) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر ، ل ٧٠– ٧١.
([34]) هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل ١١٦.
([35]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٨٠.
([36]) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر، ل٧٨.
([37]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨١.
([38]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٦.
([39]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩.
([40]) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر، ل١٥٢.
([41]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١١٧.
([42]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٨.
([43]) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر،ل ١٣٩.
([44]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٩.
([45]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩.
([46]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ،ل١١٨ – ١١٩.
([47]) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر ،ل ١٢٠.
([48]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١.
([49]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥١.
([50]) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.

## سەرچاوەکان:

- **کتێبی کوردی :**


١) ئاسۆ حەسەن، لەدووریانی مەرگ و ژیاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

٢) بورهان محمدامین، تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، چ١، لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی رۆشەنبیر (لقی سلێمانی– هەولێر)، ٢٠٠٤.

٣) حەمە کاکەرەش، بێدەنگی و کۆکوژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٤) دورییە عەونی، عەرەب و کورد – ناکۆکی یان تەبایی، وەرگێرانی: سوارە قەلادزێیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١١.

٥) زوهێر کازم عەبود، دادگایی ئەنفال، وەرگێرانی: محەمەد گۆمەیی، چ١، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٠.

٦) رامیار مەحمود، بەعسیزم و سەرکوتکردنی ژیان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠١٠.

٧) سۆزان کەریم مستەفا، بەعسیزم و کورد، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧ .

٨) شەمزین جیهانی، کورتە باسێك لەسەر ئەنفال، چ١، رۆژهەلات، هەولێر، بەبێ سالی چاپ.

٩) عەبدولقادر سەعید، فرمێسکی بەفر، چ١، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٢.

١٠) عەدالەت عومەر سالح، ئەنفال و ئافرەتی کورد، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.

١١) عەلی مەحمود محەمەد، چەند لاپەرەیەکی شاراوە لە مێژووی کۆمەلکوژییەکان، چ١، چاپخانەی ئارابخا، کەرکوك، ٢٠٠٦.

١٢) د. ئەحمەد شەریف عەلی، ئەنفال لە رۆمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠١٠.

١٣) د. ئەوان و. ئەندەرسن – د. خەلیل هـ.رەشیدیان، عێراق و بەردەوامی قەیرانی خۆرهەلاتی ناوەراست، وەرگێرانی: فوئادی تاهیر سادق، چ١، چاپخانەی روون، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٤) فاروق رەفیق، مالێکی لێکترازاو و ویژدانێکی بیمار، چاپی دووەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٣ .

١٥) کەنعان مەکییە، دلرەقی و بێدەنگی، وەرگێرانی: حەمە رەشید، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٦) محەمەد ڕەئوف عبدالعزیز، ئەنفال و ڕەهەندە سۆسیۆلۆجییەکانی، چ١، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٥.
١٧) یوسف دزەیی، ئەنفال، کارەسات، ئەنجام و ڕەهەندەکانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

- **کتێبی عەرەبی:**

١) شورش رسول حاجي، انفال الكورد و دولة العراق، مطبعة شفان، سليمانية، ٢٠٠٥.
٢) الامام العلامة محمد جمال الدين القاسمى، المسمي محاسن التاويل، مجلد٥، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٧.
٣) ميشيل عفلق، معركة المصير الواحد، بيروت – لبنان، ١٩٧٥.
٤) بدون اسم المؤلف، حزب البعث العربى الاشتراكي، ط٢، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧.

- **گۆڤار:**

أ– ڕەهەند ، ژ٧، ١٩٩٩.

- **سایتی ئەلیکترۆنی:**

http://govarikoch.com/%28A%28geNMBTzJzgEkAAAAMThjOTkxZTctZTUwYy00YzljLTlkODYtYjY3YjQxYzAyNzhidJIQEPWbae9YStFNbHG8WaMooQo1%29%29/Detail.aspx?id=34&LinkID=8
https://ar.wikipedia.org/wiki/%D9%85%D9%8A%D8%B4%D9%8A%D9%84_%D8%B9%D9%81%D9%84%D9%82

## ملخص البحث

عملية الأنفال كانت نتيجة التركيبة الفكرية لنظام البعث وأمثاله، وهـذا النظـام يمثل اتجاهاً سياسـياً معاديـاً للمجتمـع الكـوردي، لـذلك نـرى بـأن التـدمير والخـراب يشكلان جزء من هـذه الأفكـار. "آثـار الأنفـال في روايـة "فرمێسـكى بـەفر" (دمـوع الثلج) لعبدالقادر سعيد" عنوان هذا البحث حيث تم إلقاء الضوء على تأثيرات عمليـة الأنفال على الفرد الكوردي ضمن العوامل السياسية و الإجتماعية في الرواية.

**أهمية البحث :**

الشعب الكوردي كان ومايزال ضحية الإضطهاد على مر الزمان، لذلك لم تفارق الأنفال الوطن. حيث يحمل البحث هذه الرسالة التاريخية في متنه.

**طريقة البحث:**

سلك البحث الطريقة الوصفية – التحليلية.

**حدود البحث :**

يقوم البحث بتحليل رواية "فرميسكي بفر" (دموع الثلج) فقط.

**محتويات البحث :**

يحتوي البحث على جزأين أساسيين وهما مصطلح الأنفـال كمفهـوم ولغـة مـع الآثـار الناتجـة عـن العمليـة. أمـا الجـزء الثـاني فيحلـل هـذه الآثـار في الروايـة مـع الاستنتاجات وقائمة المصادر.

## Abstract

The brutal military campaign of Anal campaign (1988) was the outcome of the Baath mentality and its structure or his matching regimes. Demolition lies in the campaigns content because it is a specific political attitude towards the Kurdish community. This paper entitled "The aftermath of Anfal in Abdulqadir Saeed's (Frmeski Bafer) "Tears of Snow". A critical analysis of the social and political aftermath of Anfal campaigns are presented in the present paper because the campaign has left its various aftermaths among the Kurdish individuals.

Significance of the study

The Kurdish community faced oppression along the history which was close to the Anfal campaign and oppression is always existed. This paper sheds lights on the scheme of oppression in the novel.

Research method

A descriptive – analytical method is used in the research.

Research limitation

Abdulqadir Saeed's (Frmeski Bafer) "Tears of Snow" is selected.

Research content

The research embraced two main parts; the first introduces the concept of Anfal and its terminological uses, as well as its aftermath. The second part applies it to the novel. Conclusion and list of references are provided.

# تۆفیق ئەفەندی و
# یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی لە کەلار
# ١٩٣١ - ١٩٥٨

م. ئەحمەد محەمەد ناسر( ئەحمەد باوەڕ)
بەشی مێژوو – کۆلێژی پەروەردە – زانکۆی گەرمیان

**پێشەکی :**

ئەم لێکۆڵینەوەی، کە سەبارەت بە مێژووی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی خوێندنە لە سەردەمی پاشایەتیدا و لە شارەدێی کەلاری ئەوکاتەدا نووسیومانە، زۆر دڵنیام لەوەی کە بایەخ و تایبەتمەندییەکی گرنگی هەیە بۆ خوێنەران و بۆ هەموو ئەوانەی، کە دەیانەوێت لە ئێستا و لە قۆناغی داهاتووشدا سەبارەت بە مێژووی پەروەردە و خوێندن بنووسن، لە باشووری کوردستان و بە تایبەتی ناوچەی گەرمیاندا، چونکە زۆر دڵنیام لەوەی زۆرێك لەو زانیارییانەی لە چوارچێوەی ئەم نووسینەدا هاتوون، ئەگەر زوو فریای نەکەوتینایە، ئەوا ئەمیش وەك هەرلایەنێکی تری شاراوەی مێژووییمان بە نەزانراوی و پڕلە هەڵەی مێژوویی دەمایەوەو هەر ئەوساکەش ئەرکی مێژوونووس و دەستەی ڕووناکبیریی کوردی لە تەواوی گەرمیان و ناوچەکەدا قورستر دەکرد، ئەمەشی کە دەیڵێم : ئەگەر هاوکاریی برایانە و کارقایمی کەسێکی وەك: ڕەفیق حیلمی (١٩٣٠)[1] کوڕی یەکەم بەڕێوەبەری قوتابخانەی کەلار، محەمەد تۆفیق ئەفەندی (١٨٨٦– ١٩٤٧) نەبوایە، سەرەڕای کارئاسانی مامۆستا تایەری سەیدعەبدوڵلا بۆ ناسینی ئەو کەسایەتییە بە ئێمە، بێگومان ئەم نووسینەش بەو شێوەیەی کە هەیە نەدەهاتە بەرهەم، کە لێرەدا و لە چوارچێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا خستوومانەتە ڕوو. ماوەتەوە بڵێین ئەم نووسینە بەسەریەکەوە لە پێشەکی و سێ تەوەر پێك هاتووە، هەریەکەشیان لە شوێنی خۆیدا گرنگیی خۆی دەبێت و قۆناغەکانی

مێژووی پەروەردەو فێرکردنمان لە شاری کەلار و تاڕادەیەك دەوروبەریدا بۆ ڕوون دەکاتـەوە، هـەر لـە دەسـتپێکی سـەرەتاکانی خوێنـدن و سـەربردە و ژیاننامـەی یەکەم بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کەلارەوە، کە سەرەتا لە ساڵی (١٩٣١) دا دامـەزراوە، تـا دەگاتـە شـێواز و زمـانی پرۆسـەی خوێنـدن و چـۆنێتی بـە پیرەوەچوون و بـارودۆخی کۆمەڵایـەتی و کۆمـەڵانی خـەڵك لـە ناوچـەیەکی دوورە دەستی وەك کەلار و گەرمیاندا، بەتایبەتی لەو قۆناغ و هەلومەرجەدا، کـە ئاسـۆی زانست و خوێندەواری لەو دەوروبەرەدا جگە لـە حـوجرە، تەکیـە، خانـەقا و ماڵـە دەوڵەمەندەکانی ئەوکاتە، ڕۆشناییەکی ئەوتۆی تێدانەبووە.

## تەوەری یەکەم:

## کورتەیەك سەبارەت بە مێژووی نزیکی کەلار و ناوچەکە:

بەپێی زۆرێك لە سەرچاوە مێژووییەکان، پێدەچێت هەر لەساڵانی سـەدەی حەڤدەیـەمینی زایـین و بگـرە پێشتریشـەوە، بـە تـەواوی بـاری ئـاوەدانی و نیشـتەجێبوونی دانیشـتوان کەوتبێتـە ئـەم ناوچـە و تـەوەرە گرنگـەی باشـووری کوردستانەوە. هاوکات دەکرێت شاری کەلاری ئەمڕۆ و دەوروبەری بە ناوچەرگـەی ناوچـەی گـەرمیان دابنرێت و بەمـە کـۆی ئـەو بەیەکگەیشـتنە قسـەو باسـی لێـوە بکرێت، کە زۆربەی زۆری گوند و دێهاتە ئاوەدانەکانی ناوچەکە پێکەوە ببەسـتێ و ڕۆژ بەڕۆژ و قۆناغ بە قۆناغ، هەنگاوگەلی تـازەتر و گـەرم وگـوڕی تـازەتر لـە خـۆ بگرێـت . هەرچـەندە پێشـتر بـاری ئـاوەدانی و ناوچەرگـەی ئـاوەدانی بـەحوکمی ڕۆژگـار و پێداویسـتییەکانی خـەڵك، لـە ناوچـەکەدا زیـاتر لـە شـاری کفـری و دەوروبەرییەوە سەرچاوەی گرتووە و ئەویٚ ڕۆژیٚ خەڵکی ناوچەکە هەموو سـەوداو مامەڵەیـەکیان لـە شـوێنێکی ئـەوتۆوە دەسـتی پێکردبـێ و هەرچـی شمـەك و پێداویستی ڕۆژانە و کەلوپەلێکیان پێویست بووبێ، لە بازاڕی ئەو شارەدا سـاغیان کردبێتەوە و هەر ئەوێش ڕێگای هاتوچۆکردن و حەوانەوەی ئـەو هـەموو کـاروان و ڕێـڕەوە بازرگانییانـە بووبێـت، کـە زۆربـەی شـارەکانی ئەودەمـەی باشـووری کوردستان و عێراقی پێکەوە گریٚ داوە هەر ئەمەش وای لێکـردووە، کـە بـۆ خـۆی ببێتە جێی سەرنجی زۆرێك لـە ڕۆژ هـەڵات نـاس و گەڕیـدە بیانییـەکان بەتایبـەتی

هەریـەك لـە: کلۆدیـوس جـەیمس ریـچ (١٧٨٧– ١٨٢١)[٢]، جـیمس بیلـی فرێـزەر (١٧٨٣ –١٨٥٦) کە لە (١ی تشرینی دووەمـی ١٨٣٤)دا، دەگاتـە گونـدی (ژاڵـەی سەفەر) ی ناوچەی شـێروانە و کـەلار و لەوێشـەوە بـەرەو شـاری کفـری و گونـدی ئیبراهیم خانچی دەبێتەوە[٣]. جـیمس بـەکینگهام و نیبـۆر... تـاد جگـە لەوانـەش مێژوونووسی کورد ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠– ١٩٤٨) کـە لـە سـەردەمی لاویـدا و لـە: (بیرەوەرییـەکانی ژیـانم – حیـات خـاطراتي)دا، بـە تایبـەتی لـەنێوان سـاڵانی (١٨٩٣– ١٩٠٢) دا کە لە شاری سلێمانی ئەوکاتـەوە، بـە مەبەسـتی خوێنـدن لـە رێگای شاری کفرییەوە ڕووی کردۆتە شاری بەغدا، سەبارەت بە کفـری و ناوچـەکە دەنووسێت: شارۆچکەی سەلاحیە یەکێکە لە قەزاکانی سەنجەقی کەرکووکی سـەر بە ویلایەتی مووسڵ، شارۆچکەیەکی رێکوپێك و ئاووهەوایەکی خۆشـی هەیـە، دوو حەمام و چوار یان پێـنج مزگـەوت و بـازاڕێکی ڕێـك و جوانیشـی تیایـە، سـەرەڕای چوار یان پێنج قاوەخانە و ژمارەیەك خان و ئوتێـل (مسـافرخانە) جگـە لـە بـاخ و دارسـتانێکی زۆر بـە چـوار دەوری شارۆچـکەکەدا [٤]. لەگـەڵ ئەوەشـدا ناوەنـدی ڕووناکبیری و سەرچاوەکانی خوێندن بەشـێوازێکی زیـاتر و فـراوانتر لـەو شـارەوە دەستی پێکردبێ و خاڵی وەرچەرخان بە هـەموو بەشـەکانییەوە لـەوێوە کەوتۆتـە سەر سکە و ڕاستەڕێی شیاوی خۆی. بەڵام لەودەمانـەوە کـە هۆزەکـانی ناوچـەکە بەتەواوی دەستیان لە ژیانی کۆچەرایەتی هەڵگرت و لە گوند و لادێکانی ناوچەکەدا نیشتەجێ بوون، بە تایبەتی لە سەرەتادا هۆزەکـانی: ((ڕۆژبـەیانی، زەنـد، گێـژ و پاڵانی)) کە بە شێوازێکی زۆر کەمتر بە ژیانی کۆچەرییەوە سەرگەرم بوون، پاشان هۆزی گەورە و بە ناوبانگی جاف کـە لـە دەوروبـەری دەشـتی شـێروانە و کـەلاری ئـــەمڕۆیان، لەســـەر بنـــەمای نیشـــتەجێبوون، ئـــاوەدان کـــردەوە و هـــەر لـــەو دەمانەشەوە، سەرچاوەکانی ژیاری و شارستانیەت ڕۆژ بەڕۆژ ڕەوتی خۆیان بڕی و کۆمەڵانی خەڵك و دانیشتوانی ناوچەکەش، بـۆ بـژێوی و ژیـواری ڕۆژانـەی خۆیـان، وردە وردە کەوتنـە بیرکردنـەوەی تـازە و داهێنـانی تازەیـان تاڕادەیـەك دەسـت پێکرد. بۆ ئەوەی گۆڕانێکی زیاتر، هەلومەرجی ژیانیان بەرەو ئاقارێکی تۆکمـەترو نوێتردا بەرێت، شـان بەشـانی هـەموو ئەوانـەش دەروازەی نـوێتر و تازەتریـان لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی، سیاسـی و ڕووناکبیرییـەوە بـۆ بکاتـەوە. هـەر لـە مزگـەوت ،

تەکیّ، خانەقا، قوتابخانە، بنکەی تەندروستی، هێڵی تەلەفۆن و دواتر کارەبا و سەرچاوەکانی تری بوونەشار و ئاوەدانی. بەجۆرێك، هەموو ئەمانە و هەر یەکە و بۆخۆیان ڕۆڵی گرنگ و کاریگەریان لەسەر ئەو ڕەوش و بارودۆخەی ناوچەکە و بە تایبەتی شارەدێی کەلار هەبوو، کە لە ژیانی لادیّ نیشینەوە بەرەو قۆناغێکی ئەوتۆی بەریّ، کە تاڕادەیەك، گۆڕانکارییەکی بەرچاو لەگەڵ خۆیدا، بهێنێتەکایەوە و دواتر داواکاری و پێداویستی و ئارەزووەکانی کۆمەڵانی خەڵك، بباتە قۆناغێکی ئەوتۆوە، کە بە دوای سەرچاوەی پێشکەوتوو تر و گونجاوتردا بگەڕێت، بۆئەوەی ئاسۆیەکی گەشتر و ڕووناکتر لەڕێگای خۆی و نەوەکانی دوای خۆیدا بکاتەوە. شان بەشانی ئەوە هەوڵی ئەوەش بدات، کە لەو گۆشەگیری و دابڕانەی دووربخاتەوە، کە بە درێژایی مێژوو و لە ساڵانی پێشووتردا بەدەستێوە ناڵاندبووی، لەحاڵێکدا دەکرێت ئەم رەوش و پێوەرە بۆ سەرجەم شوێن و ناوچە دوورە دەستەکانی باشووری کوردستان، قسەی لێوە بکریّ و کۆمەڵانی خەڵك و دانیشتوان بخەیتە هەمان ئەو هاوکێشە و قاوغەوە، کە لەم دەڤەرەی گەرمیان و کەلاردا، دووبارە و چەند بارە بوو بووەوە. وەك دەبینیت پێش ئەوەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی خوێندن لە ساڵی (١٩٣١) دا لە کەلاری ئەوکاتەدا بکرێتەوە. پیشتر یەکەمین ناوەندی خوێندن و بنکەی خوێندەواری لە کەلاردا و لە ڕێگای مەلا محەمەدی جوانرۆیی (١٨٦٨– ١٩٣٨)[٥] وەوە و لەسەروبەندی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤– ١٩١٨) دا کراوەتەوە و تەنانەت دوای ئەویش کۆمەڵێك زانا و پیاوی ئایینی ناسراوی وەك : مەلا ئەحمەدی دەککە (١٨٨٧– ١٩٥٩)[٦]، مەلا مستەفای کەلار (١٨٩٧– ١٩٦٩) جێگایان گرتۆتەوە و هەمان ڕەوتیان لە ڕووی خوێندنەوە گرتۆتە بەر. بەڵام لێرە بە دواوە ئەو چوارچێوەیە، تاڕادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووە و زیاتر کۆمەڵانی خەڵك ڕوویان لە قوتابخانە کردووە و سەرەتا دەیان قوتابی و خوێندکار لەم شارە دێیە و دەوروبەرەیەوە ڕوویان کردۆتە ئەو قوتابخانەیەی کە بۆ یەکەم جار بەهەوڵی بەگزادەکانی جاف لە کەلار، بە تایبەتی پەرلەمانتاری ئەوکاتەی لیوای کەرکووك (شاری کفری)، کە حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف ( ١٩٠٤– ١٩٣٤)[٧] بووە، کراوەتەوە تەنانەت یەکەم کچی خۆیشی ئەختەرخان (١٩٢٦– ١٩٤٥)، خستۆتە بەر خوێندن. بۆ

ئەوەی دانیشتوان و خەڵکانی تری کەلار و ناوچەکەش، چاو لەو هەنگاوەی ئەو بکەن و هەمان ڕەوت بگرنە بەر، بۆ شکاندنی ئەو قۆرتە کۆمەڵایەتییە و کچی خۆیان بخەنە قوتابخانەو بەرخوێندن، هەرچەندە ئەوکچەی ئەو دواتر و بە گەنجی و لە تەمەنی (١٩) ساڵیدا، وەفاتی کردووە. بە جۆرێك لەهەمان ماوەدا و لە ساڵانی دواتریشدا، بە پاڵپشتی کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف (١٨٨٥–٧/١/١٩٤٩)، کە برا گەورەی حەمە بەگ بووە، بەپێی ناوەرۆکی نووسینێك کە لە گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩– ١٩٤٩)ی بە ناوبانگدا، ئاماژەی بۆ کردووە و لەسەری نووسیوە: (لە ساڵی (١٩٠٨)دا کاتێك فەتاح بەگی باوکی دنیای بەجێ هێشتووە، کەریم بەگی کوڕی کەوتە ئیدارەی ئەملاك و کاروباری عەشایەری تا (باوەنوور) و (ئیبراهیم خانچی) لە ژێر ئیدارەی موباشەرەی خۆیدا بوو. لە پاش ئیحتیلالی ئینگلیز بۆ وڵاتی عێراق و لە ساڵی (١٩١٩) دا، کە ڕەسمەن سەرۆکی هەموو عێڵاتەکانی جافی پێ سپێردرابوو، بە ڕێکوپێکی و هەشت ساڵی تەواو، کاروفرمانی ئەو عەشیرەتەی هەڵسووڕاند)[٨]. کەچی لە ساڵی (١٩٢٧) بە دواوە کە بە تەواوی مەسەلەی سەرۆکایەتی خێڵەکان هەڵگیرا و یاسای ژمارە (٥٨)ی عێراقی پاشایەتی، سەبارەت بە شێوازی بەڕێوەبردنی لیوا و قەزا و ناحیەکان بڵاوکرایەوە [٩]. ئیدی کەریم بەگی جاف بە یەکجاری لە ئاوایی کەلار دانیشت و کەسوکار و براکانی بە دەوریەوە دامەزران [١٠].

دیارە ئەمەشیان لە بەر ئەوەبووە، کە لەم ساڵە بەدواوە (ناحیەی قەڵای شێروانە)[١١]. بەپێی ئیرادەیەکی شاهانە (الارادة الملكية)، لە سەردەمی مەلیك فەیسەڵی یەکەم (١٨٨٣ –١٩٣٣)دا و لە(١٦ ئابی ١٩٢٧) دا کراوەتە مەرکەزی ناحیە[١٢]. هەر لێرەش بەدواوە بنکەی ناحیەی شێروانە لە بەرئەوەی کەریم بەگی جاف ڕازی نەبووە لە کەلاردا بێت، بۆیە دەگوێزرێتەوەو دەبرێتە گوندی (سەرقەڵا) ی ئەوکاتە[١٣]. بەڵام هەندێك سەرچاوەی دی قسە لەسەر ئەوە دەکەن، کە حکومەتی عێراق لە ساڵی (١٩٣٥) دا ناوەندی ناحیەکەی گواستۆتەوە بۆ گوندی سەرقەڵا، چونکە کەوتۆتە ناوەندی ناوچەکەوە و لەو دەمانەشدا بریتی بووە لە گوندێکی (١٠٠) ماڵی و ژمارەی دانیشتوانەکەی نزیکەی (٤٥٠) کەس بووە[١٤].

وەكـتر هەرلـە سـەردەمی كـەریم بـەگی جافـدا، ئـاوایی كـەلار ژمـارەی خێزانـەكانی گەیشـتۆتە نزیكـەی (٢٥٠) خانـەوادە و، قوتابخانـە و مەڵبەنـدی تەندروستی و مزگەوتیشی تیا دروستكردووە. هەروەها زۆریشی كۆشش كردووە لە رێگەی قوتابخانەكەدا، ئیشێكی وای كردووە كوڕ و كچ پێكـەوە تیایدا بخوێنن و هاوكات لە دێهاتی تریشەوە بە زۆر منالّ بهێنرێت بۆ خوێنـدن تیایدا، بەڕادەیـەك ژمارەی قوتابیـانی تـا ناوەنـدی چـلەكانی سـەدەی بیسـتەمی ڕابـردوو گەیشـتۆتە نزیكەی (٩٠) قوتابی بە كوڕ و كچییەوە [١٥]. لە سالآنی دواتریشدا، ئەو ژمارەیـە بەشـێوەیەك بـەرزبووەوە، كـە وەك قوتابخانەیـەكی سـەربەخۆ و لـە بینایـەكی سـەربەخۆی چـوار پۆلیـدا، كارەكـانی بـەڕێوە ببرێـت و دەرگـای بـۆ هـەموو جگەرگۆشەیەكی ئەوددەمەی ئاوایی كەلار و دەوروبەری بكرێتەوە. بەجۆرێك خالّی وەرچەرخان و ناوەندی خوێندن لە یەكەم هەنگاو و لـەم تاقـە قوتابخانەیـەوە، لـە شارەدێی كـەلاری ئەوكاتـەدا گەیانـدە ئـەو ئاسـتەی كـە لـە قۆناغـەكانی دواتـردا، دەیان قوتابخانە و ناوەندی زانستی و ڕووناكبیری تـری بـەدوادا بێـت. هەرچـەندە كەلار بۆ خۆی لە سـەرەتای حـەفتاكانی سـەدەی بیسـتەمی ڕابـردووەوە و بـەپێی مەرسومێكی كۆماری و بە بڕیارێكی سیاسی لەلایەن حكومـەتی عێراقـەوە لـە (٢٨ شوباتی ١٩٧٠) دا كرایە ناوەندی قەزا و جـەلال بـیلال پیرەبـابی (١٩٢٣– ١٩٩٣) وەك یەكەمین قائممقامی ئەم شارە دەستبەكار بووە [١٦].

سەرەڕای ئەو سیاسەتی بە بەعسكردن و بەعەرەبكردنەی كە زۆر بە چـڕی و بە تایبەتی لە پاش نسكۆی شۆڕشـی ئـەیلولی (١٩٦١– ١٩٧٥)ەوە، كـە باشـووری كوردستان و ناوچە كورد نشینەكانی گرتەوە، بـە تایبـەتی لـە شـاری خانـەقین و دێهاتەكانی ناوچـەی (بنكـورە) [١٧] و دەوروبـەری، بـە زۆری بـووە مایـەی ئـەوەی كەلار ببێتە ئەو شارو قەزا گەورەیەی ناوچەی گەرمیان و هەرێمی كوردسـتان كـە ڕۆژانە و لەو ماوەیە بە دواوە گەلێك هەنگاوی گەورە و قۆنـاغی لـەبارتر و فـراوانتر بنێت، لەڕووی ئاوەدانی و كردنەوەی ناوەندە جۆر بە جۆرەكانی بواری خوێنـدن و ڕوونـاكبیری و فەرهەنگییـەوە هـەر لـە زانكـۆو پـەیمانگای جـۆر بـەجۆرەوە، وەك ئەوەی دەكرێت و هەڵدەگرێت زۆر بـە تۆكمـەیی و وردی لەبارەیـەوە بنووسـرێت و لایەنە زیندووەكانی لە ڕووی سیاسی، ئابووری، كۆمەلآیەتی و ڕووناكبیرییەوە لێـك بدرێتـەوە و بـەوردی لـە هەڵكەوتـەی جـوگرافی و هۆكارەكـانی پێكهێنـان و دەرئەنجامەكانی بوونەشاری بدوێی.

## تەوەری دووەم:
## سەربردە و ژیاننامەی یەکەم بەڕێوەبەری
## قوتابخانەی سەرەتایی کەلار ١٨٨٦- ١٩٤٧:

یەکـەمین قوتابخانـەی سـەرەتایی خوێنـدن لـە شـاری کـەلار، کـە ئـەمڕۆ دەکەوێتـە گـەڕەکی کـەلاری کۆنـەوە، بـەپێی شوناسـنامە و دەفتـەری خزمـەتی مەدەنی یەکەمین بەڕێوەبەری کە ناوی تەواوی : محەمـەد تۆفیـق ئەفەنـدی کـوڕی وەستا عەلییـە، سـاڵی (١٣٠٣)ی کۆچـی بەرانبـەر بـە سـاڵی (١٨٨٦) زایینـی، لـە ناوەنـدی شارۆچـکەی (قـەرەداغ) لـەدایك بـووە و دایکـی نـاوی (سـەلمە) بـووە. هاوکات بەگوێرەی هەموو ئەو وێنانـەی لای ئێمـەن و تەنانـەت قسـەی بەشـێك لـە قوتابی و بنەماڵەکەشی بە بەردەوامی چاکێت و پانتۆڵی لەبەر کردووە و وەك هـەر ئەفەندیـەکی ئـەو قۆناغـە سـیدارەی لەسـەرناوە[18]. جگـە لـەوەش هـەر بـەپێی ناوەرۆکی لاپەڕەی یەکەمی دەفتەری خزمەتی مەدەنییەکەی کە ژیاننامەکەی واتە (ترجمة الحال)ی نووسراوەتەوە، بەم شێوەیە و بە وردی تۆمـارکراوە، کـە تیایـدا بە زمانی عەرەبی هاتووە:

١- الاسم: محمد توفيق افندى.
٢- اسم الاب : اوستا على.
٣- اسم الام : سلمه.
٤- الديانة : مسلم.
٥- محل وتاريخ الولادة: ١٣٠٣ هجرى — ١٨٨٦ ميلادى.
٦- التحصيل: في دار المعلمين الابتدائي / بغداد.
٧- اللغات التى يحسنها : كوردى، عربى، توركى.
٨- توقيع الموظف:

بـەپێی بەشـێك لـە سـەربردە و بیرەوەرییـەکانی خـۆی و هـەروەها ڕەفیـق حیلمـی کوڕیشـی، کـە لـەدایکبووی سـاڵی (١٩٣٠) یـە و تـا کـاتی ئـەم نووسـینە (نیسانی ٢٠١٥)، کە لە ژیاندا مـاوە، بنەماڵەکـەی ئـەوان، کـە بەڕەسـەن خـەڵکی ناوچەی قەرەداغن و لە دوو قۆناغی جیـاوازدا، بـەرەو ناوچـەی گـەرمیان و شـاری کفری بوونەتـەوە و یەکـەم وێسـتگەیان لـە دەوروبـەری سـاڵی (١٩٠٠) زایینـی دا و

بەتایبەتی لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە و، لە گوندی (بەلەگە)ی سەربە شاری (سەلاحیە) واتە کفریی ئەمڕۆ، لەگەڵ بەشێك، لە کەسوکارەکەیدا نیشتەجێ بوون و بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو تیایدا ماونەتەوە، بەڵام لێرە بەدواوەو بۆجارێکی دی بارودۆخی ژیان و مەسەلەی بێکاری و گرانی دووبارە تەنگی پێ هەڵچنیون و بە یەکجاری هاتوونەتە ناو شاری کفری خۆیەوە و لە گەڕەکی : (ئیسماعیل بەگی بابان) دا، نیشتەجێ بوون، هەر لەو دەمانەشدا بەشێکی تر لە خزم و کەسوکاریان هەرلە شاری کفریدا ژیاون لەوانە: وەستا ئەحمەد عەبدولڕەحمان، کە مامی بووە و ئەبێتە باوکی مامۆستا و نووسەری ناسراوی قۆناغی (گۆڤاری گەلاوێژ) و (دەنگی گێتی تازە) محەمەد ئەحمەد قەرەداغی (١٩١٧– ١٩٧٣)، کە نازناوی لە بواری نووسین و تەنانەت لە رێکخستنەکانی حیزبی هیواشدا بە (پشکۆ) ناسراو بووە[١٩]. جگە لەوەش یەکێك لە خاڵەکانیشی هەرلە شاری کفری ئەو دەمانەدا سلێمان قەرەداغی باوکی محەمەد سلێمان قەرەداغییە، کە دەکاتە باپیری مامۆستا ئەحمەد قەرەداغیی بەڕێوەبەری: (قوتابخانەی سەرەتایی دووەمی کفری) لە چلەکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا[٢٠].

وەك دەشگێڕێتەوە دوای ماوەیەك، بەگەیشتنیان بۆ شاری کفریی ئەوکاتە، هەر لەم شارەدا خراوەتە بەر خوێندن و دوای چەند ساڵێك، توانیویەتی هەردوو قۆناغی سەرەتایی (صبیان مكتەبی) و ناوەندی (ڕوشدیە)[٢١] کە لە دەوروبەری ساڵی (١٣١٨) کۆچی بەرانبەر بە ساڵی (١٩٠٠) ی زایینی، کە بۆ یەکەم جار لەم شارەدا کراوەتەوە[٢٢]. بە سەرکەوتوویی تەواو بکات و لە ساڵی (١٣٢٤) ی کۆچی بەرانبەر بە ساڵی (١٩٠٦) ی زایینی، لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی ئەوکاتەی شاری بەغدا واتە (دار المعلمین الابتدائیة/ بغداد)[٢٣]. کە چەند ساڵێك بوو کرابووەوە وەردەگیرێت. هەروەها بەپێی بڕوانامە (جداری) کەشی، کە بەزمانی تورکی عوسمانلییە و لەسەری نووسراوە (دار المعلمین شهادتنامەسی) هاوکات هەر بەتورکی لە سەری نووسراوە : (دولت علیە عثمانیة معارف عمومیة نظارتی)، وەك ئەوەی دوای چوارساڵی تەواوی خوێندن ئەم قۆناغەشی تەواوکردووە و بەڕوونی لەسەریشی نووسراوە بە پلەی: (علی الاعلی في العلوم) و (علی الاعلی في

دەنگی گێتی تازەدا نووسین و وەرگێڕانی هەیە و نازناوی (پشکۆ) بووە، لە (١٩٥٩) دا واتە ئەوکاتەی کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی (غازی) دەبێت لەلایەن تۆرانچییەکانی کەرکووکەوە تێزاب دەکرێتە سەروچاویا و ئازارێکی زۆری دەدەن، جگە لە کوردی، زمانەکانی عەرەبی و تورکی بەباشی زانیوە و لە (١٧/ ٦ / ١٩٧٣) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە کفری نێژراوە. مستەفا نەریمان، ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، (بەغدا : ٢٠٠٧)، ل١٣٠، دیدەنی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی تۆفیق ئەفەندی، کەرکوك، ٢٣/ ٤ / ٢٠١٥، مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ١١٨.

[٢٠] مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، (بەغدا : ١٩٨٦)، ل ١٩٧.

[٢١] سەبارەت بە (قوتابخانەی روشدیە) لە هەرسێ ویلاتەکەی عێراق لە ساڵی (١٩٠٠) بەدواوە بەم شێوەیە بووە، ویلایەتی بەغدا لە ساڵی ١٩٠٥دا تەنها (١٩) قوتابخانە هەبووە، لە ویلایەتی مووسڵ (١٤) قوتابخانە و لە ویلایەتی بەسرەش تەنها (٧) قوتابخانەی تیابووە. بڕوانە : ابراهیم خلیل احمد، تطور التعلیم الوطني في العراق ١٨٦٩– ١٩٣٢، ط١، (البصرة: ١٩٨٢)، ص ٤٥– ٤٦.

[٢٢] عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات ومباحث في تاریخ الکورد والعراق المعاصر، ط١،(اربیل: ٢٠٠٧)، ص ١١٤.

[٢٣] لە دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠) ی زایینی و ماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانیدا تەنها سێ خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە عێراقی ئەو دەمانەدا کراونەتەوە، یەکەمیان: لە بەغدا و ئەوانی دی لە مووسڵ و بەسرە، بە جۆرێك خوێندن لەم سێ خانەیەداو بۆ یەکەم جار تەنها بۆ ماوەی سێ ساڵ بووە پاش تەواوکردنی قۆناغی ڕوشدیە، دواتر کراوەتە چوار ساڵ و دیارترین ئەو وانانەشی کە خوێندکار لەم قۆناغەدا خوێندوونی بەسەر یەکەوە بریتی بووە لە بابەتەکانی وەك : (بنەماکانی وانە وتنەوە، زمانی تورکی، بیرکاری، زانست و سروشت لەگەڵ مێژوو). بڕوانە : حنان عیسی الجبوري، مشکلات ادارة المدرسة الثانویة في العراق، (بغداد : ١٩٧٠)، ص ١٨٢.

[٢٤] شهادتنامە، دولت علیە عثمانیة معارف عمومیة نظارتی، اسمی : محمد توفیق افندی، کنەسی : بن علی اغا شهادتنامە درجەسی، محل ولادتی : صلاحیە، تاریخ تولیدی : ١٣٠٣، اشبو شهادتنامە بغداد معارف تصدیقنجە تصدیق اولنور ١٣٢٩.

[٢٥] هەموو بەڵگەنامەیەکی پێویست سەبارەت مامۆستا محەمەد تۆفیق وەستا عەلی عەبدولڕەحمان ئەفەندی قەرەداغی لەبەر دەستدایە و هەمووماں بە پێزانینێکی زۆرەوە لە ڕێگای کاك : (ڕەفیق حیلمی) کوڕییەوە پێ گەیشتووەو زۆر بەجوانی تا ئێستا ئەو گەنجینە گرنگەی باوکی پاراستووە.کە جێگای ڕێزلێنانێکی گەورەیە، چونکە بەڕاستی ئەو زانیارییە گرنگانەی ناو ئەرشیفەکەی ئەوان نەبوایە، ئێمە نەماندەتوانی بابەتێکی ئەوتۆ

بنووسین و زۆرلایەنی شاراوەی مێژوویی سەرەتاکانی خوێندنمان لە کەلاردا بە نەزانراوی و شاراوەیی دەمایەوە.

(٢٦) دیدەنی لەگەڵ ڕەفیق حلمی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکووك، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

(٢٧) الحکومه العراقیة، وزارة الداخلیة، دفتر الخدمة المدنیة، نموذج عام (١٨)، ص ٢.

(٢٨) محمد شاکلی، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسینیات من القرن الماضي، سرد توثیقي من الذاکرة لاحوال التربیة والتعلیم في قضاء کفري واطرافه، (کرکوك : ٢٠١٥)، ص ٢٣، حسین کلاري، صفحات مطویة من تاریخ مدرسة کلار الابتدائیة المختلطه في الخمسینیات، کرکوك الیوم (مجلة)، مجلة فصلیة علمیة تصدر عن الجمعیة الثقافیة و الاجتماعیة في کرکوك، العدد (١٩) ایلول ٢٠١٤، ص ٢٢.

(٢٩) ئەم زانیارییانەی کە تۆمارمان کردوون، بەپێی دەستنووسەکانی خۆیەتی.

(٣٠) الحکومه العراقیة، وزارة الداخلیة، دفتر الخدمة المدنیة، نموذج عام (١٨)، ص ١٦– ٢٨.

(٣١) دیدەنی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکووك، ئەیلولی ٢٠١٤.

(٣٢) عبدالرزاق الحسني، (تاریخ الوزارات العراقیة)، دار الشؤن الثقافیة العامة، ط٧، ج١٠، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ٦٦، ئەحمەد باوەڕ، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هاوچەرخی کورد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ ١، (سلێمانی: ٢٠٠٣)، ل ٨٢– ٨٨.

(٣٣) ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا ١٩٢٥– ١٩٥٨، (هەولێر : ٢٠٠٧)، ل ٧٩.

(٣٤) عبدالفتاح علي یحیی البوتاني، وثائق عن الحرکة القومیة الکردیة التحرریة، ملاحظات تاریخیة ودراسات اولیة، (اربیل : ٢٠٠١)، ص ٥٥–٥٦.

(٣٥) احمد محمد امین قادر، موقف مجلس النواب العراقي من القضیة الکردیة في العراق ١٩٢٥– ١٩٤٥، (السلیمانیة : ٢٠٠٧)، ص ١٩٩.

(٣٦) عبدالرزاق الحسني، (تاریخ الوزارات العراقیة)، دار الشؤن الثقافیة العامة، ط٧، ج٣، (بغداد : ١٩٨٨)، ص ٦٦، ابراهیم خلیل احمد، تطور التعلیم الوطني في العراق ١٨٦٩– ١٩٣٢، ص ٢٩٢، نەبیل عەگید مەحموود ئەلموزەفەری، ڕۆڵی نوێنەرانی کەرکووك لەئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، سەردەمی پاشایەتی، ١٩٢٥ – ١٩٥٨، و : دکتۆر حەسەن جاف، (هەولێر: ٢٠١٢)، ل٥.

(٣٧) نەبیل عەگید مەحموود ئەلموزەفەری، ڕۆڵی نوێنەرانی کەرکووك لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، ل ٨.

(٣٨) ابراهیم خلیل احمد ، المصدر السابق، ص ٢٩٣.

(٣٩) دەستنووسەکانی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، هەروەها دیدەنی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی کوڕی محەمەد تۆفیق ئەفەندی لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٠، کەرکووك، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

(٤٠) الحکومة العراقیة، وزارة الداخلیة، دفتر الخدمة المدنیة، نموذج عام (١٨)، ص ٣٠.

[٤١] دیدەنی لەگەڵ خەلیفە مەحموودی وەستا ڕەشید (١٩٢٣) قوتابی دەورەی یەکەم (١٩٣١– ١٩٣٢)، قوتابخانەی سەرەتایی کەلار، کەلار (٧/ ٥ / ٢٠١٥).

[٤٢] دیدەنی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکوك، ئەیلولی ٢٠١٤.

[٤٣] بڕوانە : یەکەمین تۆماری گشتی (قید عام) ژمارە (١)، ساڵی خوێندنی (١٩٣١– ١٩٣٢) قوتابخانەی کەلار.

[٤٤] دیدەنی لەگەڵ خەلیفە مەحموودی وەستا ڕەشید (١٩٢٣)، کەلار، (٧ / ٥ / ٢٠١٥).

[٤٥] بڕوانە : یەکەمین تۆماری گشتی (قید عام) ژمارە (١)، خوێندنی (١٩٣١– ١٩٣٢) قوتابخانەی کەلار.

[٤٦] بڕوانە : یەکەمین تۆماری گشتی، ژمارە (١)، خوێندنی (١٩٣١– ١٩٣٢) قوتابخانەی کەلار.

[٤٧] مستەفا نەریمان: ساڵی (١٩٢٥) لە کفری لەدایك بووە، بەڕەسەن لە بنەماڵەی پیر خدری شاهۆن، خوێندنی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندی لە کفری و کەرکوك تەواو کردووە، دواتر خانەی مامۆستایانی لە بەغداو لە گەلێك شوێنی وەك : کەلار، کفری، کوڵەجۆ، کەرکوك و بەغدا مامۆستا و سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بووە، جگە لە بلاَوکردنەوەی چەندین کتێب لە بوارەکانی : ئەدەب، مێژوو، ڕۆژنامەوانی و بیبلۆگرافیا، هاوکات ئەندامی (هیوا) بووە، دوای خانەنشین بوونی، لە دەزگای ڕۆشنبیری و بلاَوکردنەوەی کوردی لە بەغدا لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاری کردووە و لە (٢٧/ ٥/ ١٩٩٥) دا هەر لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (محەمەد سەکران) نێژراوە بڕوانە : جمال بابان، اعلام کرد العراق، (السلیمانیة :٢٠٠٦)، ص ٨٠٤– ٨٠٥.

[٤٨] مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ٢٥.

[٤٩] ئەحمەد خواجە، چیم دی، شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەزن، چ٣، (هەولێر : ٢٠١٣)، ل٢٤٧.

[٥٠] محەمەد ئەمین عەسری : ساڵی (١٩٠٠) لەدایك بووە، لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا لە کەلار مامۆستا بووە، ماوەیەکی زۆر سەرگەرمی گەڕان بووە بەدوای کتێبی کۆندا، بۆ ئەو مەبەستەش سەردانی شارەکانی : (ئەستەمبووڵ و قاهیرە و تاران)ی کردووە و لە ئەستەمبووڵەوە بەزۆری ئەوکتێبانەی هێناوەتەوە، کە بەزمانی تورکی عوسمانلی بوون و دوای ساغکردنەوە و وەرگێڕانیان، کە کۆمەڵێك نووسەرو وەرگێڕی کوردی ئەو دەمانە، وەریان دەگێڕا لە چاپخانەکەی خۆی کە ناوی (تەرەقی) بووە لە گەڕەکی (پیریادی) چاپی کردوون، لەوانە : لەیلاو مەجنون، شیرین و فەرهاد، شیرین و خەسرەو، چل تووتی، لە (١٩٧٥) دا وەفاتی کردووە. بڕوانە : مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ١٨٢ – ١٨٣.

[٥١] مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم ، ل ١٨٢.

[٥٢] مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم ، ل ٧٥– ٧٦.

(٥٣) ئـەم بەڕێوەبەرایەتییـە لـە (١٩٤٦)دا هەڵوەشـاوەتەوە و پاشـان بـۆ هـەر لیوایـەك بەڕێوەبەرایەتییەکی سەربەخۆ کراوەتەوە، بڕوانە: مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ٧٥.

(٥٤) ڕەفیق حیلمی : ساڵی (١٨٩٨) لە کەرکوك لە دایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەنـدی لەکەرکوك و سلێمانی و ئامادەیی لە کـەرکوك تـەواو کـردووە. پـەیمانگای ئەنـدازیاری لـە ئەسـتەمبووڵ خوێنـدووە و لـە (١٩٢٠)دا گەڕاوەتـەوە باشـووری کوردسـتان و لـە دووەمـین حکومداریەتی شێخ مەحموودا ڕاوێـژکاری سیاسـی بـووە و یـەکێك بـووە لـە بەشـداربووانی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی (١٩٣٠)، هاوکات بەشـداری کـردووە لـە دروسـتکردنی کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییـەکانی وەك: کۆمەڵـەی کوردسـتان ١٩٢٢، کۆمەڵـەی پشـتیوانی کـوردان ١٩٢٧، حیزبـی هیـوا ١٩٣٩، لـە بەرهەمـەکانی : یاداشـت (٧) بـەرگ، شـیعرو ئەدەبیاتی کوردی (٢) بەرگ، خولاسەی مەسەلەی کوردستان وەرگێڕان لـە فەرەنسـییەوە، پاش تەموز : دیوانی شیعر ١٩٦٠ جگە لە زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، تورکی، فارسـی و فەرەنسـی بـە باشـی زانیـوە. بڕوانـە: شـکری محەمـەد سـەگبان، پرسـی کـورد کێشـەگەلی کەمینە نەتەوەکان، لە فەرەنسییەوە: نـەجاتی عەبـدوڵڵا، (هـەولێر : ٢٠١٣)، ل ٨٤– ٨٥، محەمەد فاتح، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشـوور، (هـەولێر : ٢٠١٤)، ل ٣٧٤– ٣٧٥.

(٥٥) مسـتەفا نـەریمان، بیرەوەرییـەکانی ژیـانم، ل ٧٥، دیـدەنی لەگـەڵ ڕەفیـق حیلمـی تۆفیـق ئەفەندی، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

(٥٦) کاك ڕەفیق حیلمی کوڕی تۆفیق ئەفەندی ئەڵێت: منداڵ بـووم مامۆسـتا ڕەفیـق حیلمـی کـە ئەوکاتـە سەرپـەرشـتیاری پـەروەردەیی بـوو، شـەوێك لـە کـەلار لـە ماڵمـان مایـەوە، دایکـم بەگەڵای تۆڵەکە دۆڵمەی لێ نابوو، بە باوکمی دەوت باشە تۆفیق ئەفەندی، هێشتا گەڵا مێـو دەرنەچووە، ئەم دۆڵمەیەتان بە چی لێناوە، باوکیشـم پێـی وت: ئـەوە گـەڵا مێـو نییـە لـە گەڵای تۆڵەکەی دەشتی کەلار لێنراوە.

(٥٧) محمد شاكلي، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسينيات من القرن الماضي، ص ٢٧.

(٥٨) دیدەنی لەگـەڵ ڕەفیـق حیلمـی کـوڕی محەمـەد تۆفیـق ئەفەنـدی، کـەرکووك، (١٥ ئـەیلولی ٢٠١٤).

(٥٩) مزگەوتی خانەقا : ئەم مزگەوتەی شاری کفری لەسەر ڕاسپاردەی شێخ نیزامەدینی کـوڕی شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمانی نەقشبەندی (١٨٣٩– ١٩٠٠) دروستکراوە، زەوییەکـەی موڵکی مەجید پاشای بابان بووە و بەمەبەسـتی دروسـتکردنی مزگەوتەکە بەخشـیویەتی و ڕووبەرەکـەی ١٢٠٠م دووجایـە و لـە سـاڵی ١٣٠٧ ی کۆچـی بەرانبـەر بـە سـاڵی ١٨٨٩ دا تـەواوکراوە، بـە هـۆی ڕووپۆشـکردنی دیـوی دەرەوەیـەوە، بـە کاشـی جۆراوجـۆر لـە ناوکوردەکانی کفریدا بە مزگەوتی (منارە نەخشینە و لە ناو تورکمانەکانیشدا بـە (ناقشلی

جامعی) باسی لێوە دەکرێت بۆ دواجارو لە ساڵی (٢٠٠٨) دا، لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە و لەسەر دیزاینێکی جوان، دوای دارمانی، جارێکی دی بونیادنراوەتەوە. بڕوانە : مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، ل ٦٠، سەلاحەدین عەبدولحەمید عەبدوڵلا، شاری کفری لە تەرازووی ڕەسەنایەتی و شارستانیەتدا، چ٢، (سلێمانی :٢٠١٢)، ل ١١٤.

(٦٠) مستەفا ڕێژی : مستەفا ئەفەندی مال الله، لە شاری کفریدا بە(مستەفا ڕێژی) ناسراوە و ساڵی (١٩٦٠) وەفاتی کردووە، یەکێك بووە لەو کەسایەتییانەی لەم شارەدا لقێکی کۆمەڵە (ئیتحاد و تەرەقی) کردۆتەوە و هەرخۆشی سەرۆکی بووە و کۆمەڵێك لە خەڵکی ئەم شارە پەیوەندییان پێوەکردووەو زۆربەی بلاوکراوەکانی ئەو ڕێکخراوە کە لە ئەستەمبووڵەوە هاتووە، گەیشتۆتە دەستیان و بە ناو خەڵکدا بلاویان کردۆتەوە، جگە لەوانە مستەفا ڕێژی ڕۆشنبیرێکی شارەزای بوارەکانی ئەدەب و مێژوو بووە و کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبووە. مستەفا نەریمان، بیرەوەرییەکانی ژیانم، ل ١٥، مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، ل ٧٤.

(٦١) حەسەن عەباس ڕەزا مەهدی: ساڵی (١٩١٣) لە کفری لەدایك بووە، دایکی ناوی بەهیجە ئیبراهیمە، خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە بەغدا تەواوکردووە، لە ساڵی (١٩٣٨)دا لە کەلار دامەزراوە، دوایی کراوەتە بەڕێوەبەری (قوتابخانەی ئەمیریەی سەرەتایی) لە قەرەتەپە، پاشان گواستراوەتەوە خورماتوو تا (١٩٥٤)، دواتر گەڕاوەتەوە قەرەتەپە تا (١٩٥٦)، ئینجا بۆتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی (الاتحاد) لە کفری و لە (١٩٦٩) دا خانەنشین کراوە، لە (٢٦/ ٩/ ١٩٩٧)دا لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی (باوەشاسوار)ی شاری کفری نێژراوە. دیدەنی لەگەڵ مامۆستا گویلەر حەسەن عەباس ڕەزا (١٩٤١)، قەرەتەپە، ٢٤ / ٤ / ٢٠١٥.

(٦٢) خورشید عەزیز عەبدولڕەحمان، ساڵی (١٩٢٨) لە کفری لە دایك بووە، خوێندنی سەرەتایی هەر لەم شارە تەواو کردووەو پاشان خانەی مامۆستایانی ریفی لە (بەعقوبە) خوێندووە، لە (١٩٥١) دا لە کەلار دامەزراوە، لە (١٩٥٤)دا و دوای گواستنەوەی دووبارە دێتەوە کەلار و تاساڵی (١٩٦٠) تیایدا دەمێنێتەوە، لە (٢٠١٢) دا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە : حسین کلاری، صفحات مطویة من تاريخ مدرسة كلار الابتدائية، ص ٢٢.

(٦٣) حسين كلاري، المصدر السابق ، ص ٢٢.

(٦٤) دیدەنی لەگەڵ نووسەر خەسرەو جاف، هەولێر، (١ / ٥ / ٢٠١٥).

(٦٥) انظر : محمد شاكلي، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسينيات من القرن الماضي، ص ٢٢ – ٤٧.

(٦٦) حسين كلاري، المصدر السابق، ص ٢٢.

(٦٦) رشأ هشام جميل العاني، الآثار الاجتماعية للحرب العالمية الثانية على العراق ١٩٣٩–١٩٤٥، وهي جزء من متطلبات درجة ماجستير، في التاريخ الحديث، الى مجلس كلية التربية (ابن رشد) جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٩٩)، ص ١٤٢.

(٦٨) نبيل عكيد محمود المظفرى، دور نواب كركوك في مجلس النواب العراقي خلال العهد الملكي ١٩٢٥ – ١٩٥٨، (كركوك: ٢٠٠٩)، ص ١٤٦، ١٦١، ١٧٢، ١٧٥، ١٨٤.

(٦٩) نبيل عكيد محمود المظفرى، المصدر السابق، ص ١٦٧.

(٧٠) دیدەنی لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەی سەرقەڵا، دکتۆر ئیسماعیل نەجمەدین نامیق زەنگەنە، کەلار (٢٧ / ٤ / ٢٠١٥).

(٧١) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا بەهجەت بەدری بەیاتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کەلار لە نێوان ساڵانی (١٩٥١– ١٩٥٥)، کفری، (کۆتایی ٢٠١٠).

(٧٢) دیدەنی لەگەڵ شێخ محەمەدی شاکەلی قوتابی کۆتایی چلەکانی قوتابخانەی کەلار، کەلار، (٢٦/ ٤ / ٢٠١٥).

(٧٣) ساڵح هاروونی، هاروونی لە مێژوودا، چ١،(سلێمانی: ٢٠١١)، ل ٧٧، حسين كلاري، صفحات مطوية، ص ٢٣.

(٧٤) دیدەنی لەگەڵ دکتۆر حەسەن کەریم جاف، کەلار، (٢ / ٥ /٢٠١٥).

(٧٥) عبدالله غفور، التشكيلات الادارية ، ص ١٦.

(٧٦) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد شاکەلی (١٩٤٨)، کەلار، (٩ / ٥ / ٢٠١٥).

(٧٧) یەکەمین تۆماری گشتی (قید عام) ژمارە (٣)، قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی.

(٧٨) یاداشتەکانی مەلا عارفی خانەقین ١٩١٢– ١٩٩٨، دەستنووس، لای نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە پارێزراوە.

## لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم / بەزمانی کوردی :**

(١) ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا ١٩٢٥– ١٩٥٨، (هەولێر : ٢٠٠٧).
(٢) ئەحمەد خواجە، چیم دی، شۆڕشەکانی شێخ مەحموودی مەزن، چ٣، (هەولێر : ٢٠١٣)
(٣) ئەحمەد باوەڕ، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هاوچەرخی کورد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ١، (سلێمانی : ٢٠٠٣).
(٤) شکری محەمەد سەگبان، پرسی کورد کێشەگەلی کەمینە نەتەوەکان، لە فەرەنسییەوە : دکتۆر نەجاتی عەبدوڵلا، (هەولێر: ٢٠١٣).
(٥) سالح هاروونی، هاروونی لە مێژوودا، چ١، (سلێمانی : ٢٠١١).
(٦) محەمەد فاتح، پەرەسەندنی ژیانی حیزبایەتی لە کوردستانی باشوور، (هەولێر : ٢٠١٤).
(٧) سەلاحەدین عەبدولحەمید عەبدوڵلا، شاری کفری لە تەرازووی ڕەسەنایەتی و شارستانیەتدا، چ٢، (سلێمانی :٢٠١٢).
(٨) نەبیل عەگید مەحموود ئەلموزەفەری، ڕۆڵی نوێنەرانی کەرکووك لەئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا (سەردەمی پاشایەتی) ١٩٢٥ – ١٩٥٨، وەرگێڕانی : دکتۆر حەسەن جاف، (هەولێر: ٢٠١٢).
(٩) مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، (بەغدا : ١٩٨٦)، ل ١٩٧.
(١٠) شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، (بەغدا : ١٩٨٦).
(١١) ئەدیب و نووسەرانی کفری و دەوروپشتی، (بەغدا : ٢٠٠٧).
(١٢) محەمەد هادی دەفتەری، عەبدوڵلا حەسەن، عێراقی باکور، لیوای کەرکوك و دیالە ساڵی ١٩٥٥، وەرگێڕانی : موعتەسەم محەمەد، (سلێمانی : ٢٠٠٣).
(١٣) کلاۆدیوس جەیمس ڕیچ، گەشتنامەی ڕیچ بۆکوردستان ١٨٢٠، و: محەمەد حەمەباقی، ب١، (سلێمانی : ٢٠١٢).
(١٤) محەمەد عەلی قەرەداغی، ئەلبوومی کەشکۆڵ، ب١، لە بلاۆکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر : ٢٠٠٨).

**دووەم / بەزمانی عەرەبی :**

(١) ابراهيم خليل احمد، تطور التعليم الوطني في العراق ١٨٦٩– ١٩٣٢، ط١، (البصرة).
(٢) احمد محمد امين قادر، موقف مجلس النواب العراقي من القضية الكردية في العراق ١٩٢٥– ١٩٤٥، (السليمانية: ٢٠٠٧)
(٣) جمال بابان، اعلام كرد العراق، (السليمانية : ٢٠٠٦).
(٤) جيمس بيلي فريزر، رحلة فريزر الى بغداد في ١٨٣٤، نقلها الى العربية : جعفر الخياط، الرافدين، ط٢ (بيروت: ٢٠١٤).

(٥) حنان عيسى الجبوري، مشكلات ادارة المدرسة الثانوية في العراق، (بغداد : ١٩٧٠).
(٦) عبدالله غفور، التشكيلات الادارية في جنوب كردستان، الطبعة الثالثة مزيدة ومنقحة، (اربيل: ٢٠١٤).
(٧)– عبدالرزاق الحسني، (تاريخ الوزارات العراقية)، دار الشؤن الثقافية العامة، ط٧، ج٣،(بغداد : ١٩٨٨).
(٨) عبدالرزاق الحسني، (تاريخ الوزارات العراقية)، دار الشؤن الثقافية العامة، ط٧، ج١٠،(بغداد : ١٩٨٨).
(٩) عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية، ملاحظات تاريخية ودراسة اولية، (اربيل: ٢٠٠١).
(١٠) عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، ط١، (اربيل : ٢٠٠٧)
(١١)– عبد الكريم المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، عني بنشره : محمد علي القرداغي، ط١، (بغداد : ١٩٨٣).
(١٢) ذنون الطائي، الاوضاع الادارية في الموصل خلال العهد الملكي ١٩٢١– ١٩٥٨، ط١، (الموصل : ٢٠٠٨).
(١٣) نبيل عكيد محمود المظفري، دور نواب كركوك في مجلس النواب العراقي خلال العهد الملكي ١٩٢٥– ١٩٥٨، الطبعة الاولى، (كركوك : ٢٠٠٩).
(١٤) محمد شاكلي، صورة المجتمع والمدرسة في الخمسينيات من القرن الماضي، سرد توثيقي من الذاكرة لاحوال التربية والتعليم في قضاء كفري واطرافه، (كركوك : ٢٠١٥).

**سێیەم / بەزمانی فارسی :**

(١) كريم بيگ فتاح بيگ جاف، تاريخ جاف، ترجمة وحواشى وتعليقات : دكتر محمد على سلطانى، (اربيل : ٢٠١٢).

**چوارەم : گۆڤارەكان بە زمانی كوردی و عەرەبی :**

(١) ئەحمەد باوەڕ، جەلال بیلال مستەفا پیرەبابی ١٩٢٣– ١٩٩٣، یەكەمین قائمقامی قەزای كەلار و ڕۆڵی لە بواری كارگێڕیدا، گۆڤاری زانكۆی گەرمیان، ژمارە (٣).
(٢) حسين كلاري، صفحات مطوية من تاريخ مدرسة كلار الابتدائية المختلطة في الخمسينيات، كركوك اليوم (مجلة)، مجلة فصلية علمية ثقافية تصدر عن الجمعية الثقافية والاجتماعية في كركوك، العدد (١٩)، ايلول ٢٠١٤
(٣) محمد امين زكي بك، صفحات من دفتر ذكريات، ترجمها من التركية العثمانية : الدكتور خليل علي مراد، القسم العربي من مجلة (زين)، العدد (١)، ٢٠٠٩.
(٤) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٧)، ساڵی ١٩٤٩.

**پێنجەم / بەڵگەنامەو دەستنووسی بڵاونەکراوە بە تورکی و عەرەبی و کوردی :**

(١) شهادتنامه، دولت علیه عثمانیة معارف عمومیة نظارتی، اسمی : محمد توفیق افندی، کنەسی : بن علی اغا شهادتنامه درجەسی، محل ولادتی : صلاحیه، تاریخ تولیدی : ١٣٠٣، اشبو شهادتنامه بغداد معارف تصدیقنجه تصدیق اولنور ١٣٢٩.

(٢)– بعض المخطوطات الشخصية للسيد محمد توفيق علي عبدالرحمن، مدير مدرسة كلار سنة ١٩٣١ –١٩٣٨.

(٣) دفتر الخدمة المدنية، نموذج عام (١٨).

(٤) یەکەمین تۆماری گشتی (قید عام) قوتابخانەی کەلار، ژمارە (١)، ساڵی خوێندنی (١٩٣١–١٩٣٢).

(٥) دەستنووسەکانی ڕەفیق حیلمی کوڕی محەمەد تۆفیق ئەفەندی لەبارەی ساڵانی خوێندنی خۆی و مامۆستایی باوکیەوە.

(٦) یاداشتەکانی مەلا عارفی خانەقین ١٩١٢– ١٩٩٨، دەستنووس، لای نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە پارێزراوە.

**شەشەم / نامەی زانکۆیی بەزمانی عەرەبی :**

(١) رشأ هشام جميل العاني، الآثار الاجتماعية للحرب العالمية الثانية على العراق ١٩٣٩ – ١٩٤٥، وهی جزء من متطلبات درجة ماجستير، آداب في التاريخ الحديث، الى مجلس كلية التربية (ابن رشد) في جامعة بغداد، (بغداد : ١٩٩٩).

**حەوتەم / دیدەنی تایبەت :**

(١) دیدەنی لەگەڵ کاك ڕەفیق حیلمی کوڕی محەمەد تۆفیق ئەفەندی، کەرکووك، (١٥ ئەیلولی ٢٠١٤).

(٢) دیدەنی لەگەڵ خەلیفە مەحموودی وەستا ڕەشید (١٩٢٣) قوتابی دەورەی یەکەم، کەلار، (٧ / ٥ / ٢٠١٥).

(٣) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا بەهجەت بەدری بەیاتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کەلار لە نێوان ساڵانی (١٩٥١– ١٩٥٦)، کفری، (کۆتایی ٢٠١٠).

(٤) دیدەنی لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەی سەرقەڵا، دکتۆر ئیسماعیل نەجمەدین نامیق، کەلار، (٢٧ / ٤ / ٢٠١٥).

(٥) دیدەنی لەگەڵ سەرپەرشتیاری پەروەردەیی خانەنشین گویلەر حەسەن عەباس ڕەزا، قەرەتەپە، (٢٤ / ٤ / ٢٠١٥).

(٦) دیدەنی لەگەڵ شێخ محەمەدی شێخ ئەحمەدی شاکەلی (١٩٤٣)، کەلار، (٢٦/ ٤ / ٢٠١٥).

(٧) دیدەنی لەگەڵ نووسەری ناسراو خەسرەو حەمە سەعید جاف، هەولێر، (١ / ٥ / ٢٠١٥).

(٨) دیدەنی لەگەڵ دکتۆر حەسەن کەریم بەگی جاف، کەلار، (٢ / ٥ /٢٠١٥).

(٩) دیدەنی لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد شاکەلی (١٩٤٨)، کەلار (٩ / ٥ / ٢٠١٥).

## ملخص البحث


هذا البحث المعنون : بـ(توفيق افندي وتاسيس اول مدرسة ابتدائية في كلار ١٩٣١ – ١٩٥٨)، يسلط الضوء على تاريخ وتأسيس اول مدرسة ابتدائية مختلطة في قضاء كلار سنة ١٩٣١، نحو اتجاه الحياة المؤسساتية الرسمية في ربوع منطقة گرميان، خصوصا منذ السنة الدراسية (١٩٣١– ١٩٣٢) وبجهود مضنية من قبل الشخصية البرلمانية الكردية محمد بيك ابن فتاح بيك ابن محمد باشا الجاف (١٩٠٤– ١٩٣٢)، ممثل لواء كركوك (قضاء كفري) لدى مجلس النواب العراقي خلال العهد الملكي (١٩٢١– ١٩٥٨) ولاسيما في الدورة الانتخابية الثانية (١٩ ايار ١٩٢٨ – اول تموز ١٩٣٠). ومن خلال مديرية معارف لواء كركوك وكذلك كيفية نقل خدمات اول معلم ومدير اليها وهو الاستاذ محمد توفيق علي عبدالرحمن أغا (١٨٨٦– ١٩٤٧)، من (المدرسة الابتدائية الاولية) في قصبة (طوزخورماتو) الى كلار آنذاك ومباشرته في (١ ايلول ١٩٣١) كما جاء واضحا في اطار اضبارته الشخصية.

وقد اعتمدت في كتابة هذا البحث على مزيد من المصادر والوثائق والسجلات الرسمية في المدرسة الابتدائية وخصوصا الوثائق والمستندات الرسمية النادرة والرصينة لدى عائلة محمد توفيق افندي اول مدير مدرسة كلار خلال سنوات (١٩٣١– ١٩٣٨)، (١٩٣٩– ١٩٤١)، وهي بحوزة الابن الاكبر له وهو الاخ رفيق حلمي بن محمد توفيق افندي ومن مواليد طوزخورماتو سنة (١٣تموز١٩٣٠)، ناهيك عن بعض الزيارات والمقابلات الشخصية مع بعض الاساتذة والشخصيات المعاصرة والمتعلقة بالدراسة.

ينقسم البحث الى مقدمة وعدة محاور رئيسة وخاتمة. يتضمن المحور الاول: مختصر تاريخ كلار القريب واطرافها، اما المحور الثاني: فيتعلق بالسيرة الشخصية للاستاذ محمد توفيق علي عبدالرحمن افندي اول معلم ومدير مدرسة كلار الابتدائية المختلطة وكذلك حياته الوظيفية كمعلم ومربي وضابط احتياط (نامزيد ضابطى) في الجيش الهمايوني العثماني خلال الحرب العالمية الاولى (١٩١٤– ١٩١٨) في بلاد الشام ومدينة حلب الى ان وافاه الاجل في اواسط شهر حزيران سنة (١٩٤٧) في مدينة كركوك ودفن في مقبرة (احمد اغا) في منطقة قوريه بجوار صديقه ورفيق دربه احمد جميل ساقي افندي العقراوي، اما المحور الثالث والاخير فيركز على كيفية افتتاح اول مدرسة ابتدائية في كلار سنة (١٩٣١) والوجبة الاولى من الطلبة المقبولين دراسيا فيها وباعمار متفرقة وكذلك نظام التعليم والمواد ولغة الدراسة فيها، ناهيك عن مردوداتها وانعكاساتها المستقبلية بين الناس والمجتمع عموما.

## Abstract

This research entitled: (Tawfiq Afandi and the Establishment of the First Primary School in Kalar during 1931 to 1958). It sheds light on the history and the establishment of the first Co-education Primary School in Kalar in 1931, towards the direction of the official institutional life throughout Garmian, especially since the school year (1931- 1932) and the Strenuous efforts by the young Kurdish Parliamentary character Mohammed Beg ibn Fattah Beg ibn Mohammed Pasha Aljaf (1904- 1932), a representative of Kirkuk Brigade (Kifri District) in the Iraqi Representative Council during the monarchy (1921-1958), especially in the second electoral cycle (May 19, 1928 - first in July 1930).

Through Directorate of Kirkuk Brigade Learning, as well as the mechanism of transferring the first teacher and director Mr. Mohammed Tawfiq Abdul Rahman Agha (1886- 1947), of (Preliminary Elementary School) in (Tuz Khurmatu) at that time and directly to Kalar in (September 1, 1931) as it has been stated in his personal file.

Many resources and documents as well as official records have been depended on in writing this paper and especially the official and rigorous documents from the family of Mohammed Tawfiq Afandy first director of Kalar Primary School during the years (1931- 1938), (1939 - 1941) which have been kept by his eldest son Rafiq Hilmi ibn Mohamed Tawfik Effendi who was born in Tuz on (July 13, 1930), not to mention some of visits and personal interviews with some professors and contemporary figures relating to the study.

The paper is divided into an introduction and several major axis and Conclusion: the first axis includes: A Brief History of Kalar and the surroundings, while the second axis: relates to the biographical

profile to Mr. Muhammad Tawfiq Abdul Rahman Effendi the first teacher and director of Kalar Co-education Primary School, and also to his career as a teacher and a breeder and also a reserve officer in Ottomani army during World War I (1914-1918) in the Levant and the city of Aleppo till passed away in mid-June (1947) in Kirkuk and buried in a cemetery (Ahmed Agha) in Kuria next to his friend and his colleague Ahmed Jameel Saqi Afandy Alaqrawi. The third and the last axis focuses on how the first primary school in Kalar opened in (1931) and the first batch of admitted students to study with different ages, as well as the educational system, the curriculum and the language of studying, not to mention their reflections and implications for future between people and society in general.

# توانسته جوگرافییەکانی
# پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەی شەمامك

**م. ی. تەنکە عوسمان سەعید**
بەشی جوگرافیا– کۆلێجی ئەدەبیات–
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

## پێشەکی

راستییەکی زانراو هەیە بەوەی کەرتی لادێ بە بەردی بناغەی پێکهێنانی ئابووریی نەتەوەیی هەژمار دەکرێت، لەمیانی ئەوەی کە ئەم کەرتە کەرستەی پێویست بەخۆراك و بەروبوومی ئاژەڵی بۆ دانیشتوانی شارەکان فەراهەم دەکات، پێویستییەکانیان پڕ دەکاتەوە، هەڵبەت کەرتی لادێ هەر لەکۆنەوە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆ هەمیشە وەك کەرتێکی بەهێز بەشداربووە، لەخستنە سەرپێی ئابووری لە وڵاتدا، ئەوەش لە میانی گرنگیی چالاکی کشتوکاڵ لەئابووریدا کە یەکێکە لەدیارترین پیشەکانی دانیشتوان لە لادێکاندا، هەر بۆیە لادێکان رۆڵیان لەدروستکردنی بنەماکانی بەرهەمهێنان و پێشەوەچوونی هەریەکێك لە کەرتەکانی ئابووری هەبووە چ کشتوکاڵ یان پیشەسازی، بۆ نموونە لە کشتوکاڵدا بەروبوومێك کە دەچێتە قۆناغی بەرهەمهێنان دوای ئەم ئەوە دەچێتە قۆناغێکی پێشکەوتووتر ئەویش بوونی بەکەرستەی پیشەسازییە، لە رۆشنایی ئەم وتەیەش ئەو راستییەمان بەدەستەوە دەدات کەوا کەرتی لادێ رۆڵێکی گرنگی لە پێشکەشکردنی رەگەزەکانی بەرهەمهێنان هەیە بۆ سەرجەم کەرتە ئابوورییەکان.

لەم سۆنگەیەوە گرنگی کەرتی لادێ زیاتر دەردەکەوێت بەتایبەتی ئەگەر ناوچەی لادێکان خاوەن توانستێکی جوگرافی (سروشتی و مرۆیی) بن بۆ زیاتر پەرەپێدانیان و هەنگاو پێنانیان لەپێناو خزمەتکردنی سێکتەرە جیاجیاکان لە ناحیەی شەمامك.

**گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە:** لەوەدا دەردەکەوێت، کە کەرتی لادێ بەبنەمای بەهێزبوونی ئابووری دادەندرێت سەرەڕای ئەوەی کە یارمەتی خستنی سەرپێی بژاوتی ئابووری شار و گوندەکان دەدات.

**ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە**، دەستنیشانکردن و باسکردنی توانستە جوگرافییەکان (سروشتی و مرۆیی)یەکانی پەرەپێدانی لادێییە لە ناحیەی شەمامك، بەئامانجی دەستنیشانکردنی گرفتەکان بۆ ئەوەی لەلایەن پلاندانەرانەوە سوودیان لێ وەربگیرێت و لەکاتی دانانی هەر پلانێکی پەرەپێدان کە بۆ ناوچەکە دادەرێژرێت.

**هۆی هەڵبژاردنی ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە:** هەڵبژاردنی ناحیەی شەمامك و پەرەپێدانی ناحیەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەڵکەوتەی جوگرافی ناحیەی شەمامك و بوونی چەندان توانستی سروشتی و مرۆیی تێدایە کە فاکتەری کاران بۆ پرۆسەی پەرەپێدانی ناوچەی لێکۆڵینەوە.

**گرفتی لێکۆڵینەوە:** بێگومان هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بەدەر نابێت لە گرفت، لەبەر ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی تائێستا بەئەندازەی پێویست لە ناوچەکەدا ئەنجام نەدراوە بۆیە لەم رووەوە گرفتی بۆ لێکۆڵەر دروست کردبوو.

**رێبازی لێکۆڵینەوە:** هەڵبەت هەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەمیانی ئەنجامدانی (شیکردنەوەی بەراوردکاری) متمانە دەخاتە سەر رێباز (منهج)ێك بۆ ئەم مەبەستە و لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشت بەستراوە بەرێبازی، (شیکردنەوە) بەراوردکاری بۆ دەستنیشانکردنی توانستە جوگرافییەکان و دەرخستنی شیکردنەوە و بەراوردکردنی گۆڕانکارییەکان لەماوەی لێکۆڵینەوەدا.

**پلانی لێکۆڵینەوە:** لەپێناو پێکانی ئامانجی لێکۆڵینەوەکە دابەشکراوە بۆ سەر چەندین بەش و باس بەم شێوەیە:

بەشی یەکەم: تایبەتە بەناساندنی ناوچەی لێکۆڵینەوە کە پێکهاتووە لە دوو باس، باسی یەکەم بریتییە لەپێگەی جوگرافی، لەکاتێکدا باسی دووەم تایبەتکراوە بۆ ناساندنی چەمکەکانی پەیوەست بەلێکۆڵینەوە کە بریتییە لە زاراوەکانی (پەرەپێدان) و (پەرەپێدانی لادێیی).

بەشی دووەم: تایبەتکراوە بۆ باسکردنی توانستە سروشتییەکانی پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەی شەمامك، کە بریتین لە هەریەك لە (بەرزی و نزمی، ئاووهەوا، خاك ، دەرامەتی ئاوی)، لەکاتێکدا بەشی سێیەم تایبەتکراوە بۆ باسکردنی توانستە مرۆییەکانی پەرەپێدانی لادێیی لەناحیەی شەمامك، بریتین لە: دانیشتوان، خەسڵەتە ئابوورییەکان (کشتوکاڵ ، ئاژەڵداری، پیشەسازی، گواستنەوە)، تەندروستی.

## بەشی یەکەم:
## ناساندنی ناوچەی لێکۆڵینەوە

**١- پێگەی جوگرافی:**

ناحیەی شەمامك[1] یەکێکە لە ناحیەکانی پارێزگای هەولێر کە دەکەوێتە بەشەکانی باشووری رۆژئاوای پارێزگاکە، لە رووی پێگەی ئەسترۆ نۆمیەوە، ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی (٢٥: ٥٤: ٣٥- ٥٥: ٩: ٣٦)ی باکوور و هەردوو هێڵی درێژی (-٧: ٤١: ٤٣- ١٩: ١: ٤٤)ی رۆژهەلاتی گۆی زەوی وەك لە (نەخشەی -١-).

سەبارەت بە پێگەی ناحیەکە بەگوێرەی یەکە کارگێڕییەکانی دەوروبەری لەباکوورەوە هاوسنوورە لەگەڵ ناحیەی (رزگاری) و لە رۆژهەلاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ ناحیەی (قوشتەپە) و لەباشوورەوە لەگەڵ ناحیەی (کەندێناوە)و، لە رۆژئاواشەوە لەگەڵ ناحیەی (گوێر) هاوسنوورە وەك لە نەخشەی (١) دەردەکەوێت، جێگەی ئاماژەبۆکردنە کە ناوچەی لێکۆڵینەوە لە (٦٦) گوند پێکدێت و رووبەرەکەی (٥٣٦)کم[2].

**ئەوەی ئاماژەی بۆ کرا دەربارەی پێگەی جوگرافی ناوچەی لێکۆڵینەوە، ئەم راستییەمان بۆ دەردەکەوێت:**

- بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافیای ناحیەکە بۆتە ناوەندێکی گرنگی هاتوچۆ بەستنەوە لەنێوان قەزای بنەسلاوە بەقەزای (خەبات) لەلایەك و هەروەها (ناوەندی هەولێر) بەقەزای (مەخمور) لەلایەکی دی، هەڵبەت ئەم هەڵکەوتەیەش بۆتە فاکتەرێکی گرنگ و کارا بۆ مەبەستی گواستنەوە و بازرگانیکردن بەبەروبوومە کشتوکاڵییەکان و پیشەسازییەکانی نێوان ئەو یەکە کارگێڕییانەی پێشوو لەگەڵ ناوچەی لێکۆڵینەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە رێگایەکی ستراتیژی گرنگە، کە رۆژانە ئەم ئۆتۆمبێلانەی لە وڵاتی تورکیاوە دێن رێگای ترانزێتی ناحیەی (شەمامك) بەکاردەهێنن، کە بارەکانیان بەرەو قەزای (مەخمور) و (پارێزگای کەرکوك) دەگوازنەوە، هەروەها لەبەر دروست نەبوونی جەنجاڵی هاتوچۆ لە(شاری هەولێر)، بۆیە ئەو ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرانە سوود لە

ڕێگای ستراتیژی ناحیەی (شەمامك) وەردەگرن بۆ گواستنەوەی بارەکانیان، لە ڕۆشنایی ئەوەی باس کرا دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە پێگەی جوگرافی ناوچەی لێکۆڵینەوە ڕۆڵێکی بەرچاو و دیاری هەبووە لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی بەهۆی گرنگی هەڵکەوتەکەی و بوونی بەناوەندی بەهێز بۆ ئاسانکردنی هاتوچۆو گواستنەوە لەنێوان ناوچەکە لەگەڵ یەکە کارگێڕییەکانی دی.

**نەخشەی ژمارە (١) پێگەی جوگرافی ناحیەی شەمامك**




سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشت بەستن بە: هاشم یاسین حەمەدئەمین، کامەران وەلی مەحمود، ئەتڵەسی پارێزگای هەولێر، چاپی دووەم.

**٢- ناساندنی چەمکەکانی پەیوەست بە لێکۆڵینەوە:**

أ- چەمکی پەرەپێدان

ب- چەمکی پەرەپێدانی لادێیی

دەربارەی ناساندن و روونکردنەوەی چەمکی "پەرەپێدان" دید و بۆچوونی جیاجیا هەن، کە هەریەکەیان راڤەی ئەم زاراوەیەی کردووە، لە چەمکێکدا پەرەپێدان ((ئەو کردارە فراوانەیە کە دادەڕێژرێت بە مەبەستی برەودان بە سەرچاوە و دەرامەتەکان لە رووبەرێك یان ناوچەیەك کە ئەنجامی ئەو کردارە ببێتە مایەی بەدەستهێنانی سوودی گشتی))[٣].

چەمکی هاوچەرخیش بۆ پەرەپێدان ((جەخت لەسەر چاکترکردنی ئەداکردنی توخمەکانی بەرهەمهێنان دەکاتەوە، پرۆسەکانی پەیوەندیدار بە بەرهەم، هەروەها لە پێشخستنی ئەو تەکنەلۆژیایەی کە مرۆڤ دایهێناوە لە پێناو خزمەتکردنی مەبەستەکانی پەرەپێدان))[٤].

راڤەیەکی دیکەی پەرەپێدان: ((بریتییە لە چەمکێکی (بڕ و جۆر) مەبەست لێی تەنیا بایەخدانە بە بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی و پیشەیی و رۆشنبیری و تەندروستی))[٥]. کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانیش سەبارەت بە چەمکی پەرەپێدان بەم شێوەیە راڤەیان کردووە: ((ئەو کردارانەیە کە لە میانی یەکگرتنی ئەرکی هەریەك لە هاوڵاتیان و حکومەت دەبێت لە پێناو چاکترکردنی هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری کۆمەڵگا ناوخۆییەکان))[٦].

شایەنی ئاماژەپێکردنە کە پەرەپێدان وەك زاراوەیەك بە شێوەیەکی فراوان لە دوای جەنگی جیهانی دووەم و سەربەخۆبوونی دەوڵەتانی کیشوەرەکانی هەریەك لە (ئاسیا) (ئەفریقیا) و (ئەمریکای باشوور) لە سەدەی رابردوودا بەکار هاتووە، بەڵام لە سەدەی نۆزدەیەم و دواتر لەلایەن ئابووری ناسانی ئەوروپایی رۆژهەڵات لە بری ئەو زاراوەیە زاراوەی نوێکردنەوە یان پێشخستنی پیشەسازی بەکارهاتووە[٧]. دیدێکی دیکەی چەمکی پەرەپێدان ((ئەو کردارەیە کە ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوەی بگات بە دڵی ئامانج و مەبەست "aims" ئەو ئامانجەش بریتییە لە مرۆڤ و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ))[٨]. فەرهەنگی جوگرافیاش بەم شێوەیە راڤەی پەرەپێدان دەکات ((کە بریتییە لە گۆڕانی پێشکەوتوو و قووڵ لە پەیکەری بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری، کە لە ئاکامدا گەشەکردنی ئابووری بەردەوامی لێ بەرهەم

دێت[٩] ، هـەروەها بریتییـە ((لـە بزاوتـی کۆمەڵگـە بـە تـەواوی کەرتەکانیـەوە رووەو ئاکامێکی دیار کە پێشتر پلانی بۆ داڕێژراوە))[١٠].

یـان کردارێکـی پـلان بـۆ داڕێـژراوە کـە ئامـانجی بەدەسـتهێنانی گۆڕانکارییـە لەتــەواوی کەرتەکانــدا، یــەکێك لــە ئامانجــە سەرەکییەکانیشــی دەســتەبەرکردنی پێداویسـتی و ئارەزووەکـانی مرۆڤـە[١١]. لـە تێڕوانینێکـی دیکـەدا هـاتووە بـەوەی پەرەپێدان جەخت لەسەر هەریەك لە ئیرادەی خەڵك و توانستەکانیان دەکات، بەوەی دوو مەرجی بنەڕەتین لـە دروسـتکردنی داینامیکیـەتی پەرەپێـدان[١٢]. لـە راڤەیـەکی دیکەدا ((پەرەپێدان)) بریتییە لە یەکگرتنی هەوڵ و کۆششی هاوڵاتیـان و حکومـەت، لەپێناو چاکترکردنی ڕەوشی ژیانی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و رۆشـنبیری و بەشـداری پێکردنی هاوڵاتیان لە پێشکەوتنی کۆمەڵگە بە کەمترین توانا[١٣]. لە رۆشنایی ئەوەی باسکرا، بـەگوێرەی  بۆچـوونی توێـژەر پەرەپێـدان بـەم شـێوەیە راڤـە دەکرێـت کـە مەبەسـت لێـی بریتییـە: لـە کردارێکـی پـلان بـۆ داڕێـژراو بـەئامانجی باشـکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی گـوزەرانو رۆشـنبیری کۆمەڵایـەتی و تاکـەکانی کۆمـەڵگا، بـۆ ئەوەی باشترین سوودیان بۆ بەدی بهێنرێت، ئەمەش  پێویستی بە گرتنەبەری رێگـاو شێوازی  گونجاو و کات هەیە بەگوێرەی  ئەو توانستانەی  کە لەژێر دەستدان.

## پەرەپێدانی لادێیی

دەربارەی ناساندنو روونکردنەوەی چەمکی ((پەرەپێـدانی لادێیـی " Rural Development")) تێـڕوانین و بۆچـوونەکان هـاوڕانین، بـەڵکو هەریـەکێکیان لـە دیدی خۆی ڕاڤـەی ئـەم زاراوەیـەی کـردووە و دایڕشـتووە...... کـە لێـرەدا رۆشـنایی دەخەینە سـەر هەریـەك لـەم بۆچـوونانە "جـۆن هـاریس" ی نووسـەر و توێـژەر بـەم شێوەیە ((پەرەپێدانی لادێیی)) ڕاڤە دەکات کە "بریتییـە لـەم ئامانجـە دیـارەی کـە بایەخ بە هەلومەرجی بەرهەمهێنان بدات لـەم وڵات و ناوچـانەی کـە دواکـەوتوون لـەم بوارەدا، کە مەبەست لێی ناوچە لادێکانە))[١٤]. لە بۆچوونێکی دیکەدا: ((پەرەپێدانی لادێیی بریتییە لە کۆمـەڵێك پرۆسـەی بەرنامـە بـۆ داڕێـژراو، ئامـانج و مەبەسـت لێـی کۆکردنـەوەی توانسـتە مـاددی و مرۆییەکانـە لـە کۆمەڵگـەدا، لـە دوایـدا رەنگرێـژی کردنــی پلانێکــی شــیاو و جێبــەجێکردنی ئــەو پلانــە، بــەئامانجی یــاخود لــەپێناو بەرزکردنــەوەی توانــا ئــابووری و کۆمەڵایــەتی و بیناســازی و ژیــاری تاکــەکانی نــاو کۆمەڵگە، لەگەڵ پێویستی بەشداریکردنی هاوڵاتیان لەم پرۆسانەدا هەر لە سەرەتاوە

تـاوەكو كۆتـایی))[١٥]. لـە دیـدێكی دیكـەدا پێـی وایـە كـە چوارچـێوەی شـیاو بـۆ ((پەرەپێدانی لادێیی)) بریتییە ((لە دەروازەی تەواوكاری ((المدخل التكاملي)))، واتە پەرەپێدانی لادێیی پرۆسەی بەشداریكردنی نێوان لادێ و شـار و لـەنێوان كەرتـەكانی گشـــتی و تایبەتـــە، هــــەروەها لـــەنێوان كەرتـــەكانی بەرهــــەمهێنان و راژە و خزمەتگوزارییەكان، كە ئامانجی ئەو پرۆسانەش روودانی گۆڕانكاری بـڕ و جۆریـە كـە رەنگدانەوەی ئەرێنی هەبێت لەسەر چاكردنی چەشنی ژیانی لادێ نشینەكاندا))[١٦].

لە ڕاڤەیەكی دیكەیدا مەبەست لە زاراوەی ((پەرەپێدانی لادێیی)) ((هەموو ئەو هەوڵ و كۆششـانە دەگرێتـەوە كـە رێكخراوەكـان و دەسـتەكانی حكومـەت ئـەنجامی دەدەن لەپێناو ئەوەی كە كەرتی لادێ بكەن بە زۆرترین كەرتی بەرهەمهێنان))[١٧].

لـە دیـدێكی دیكـەی چـەمكی پەرەپێـدانی لادێیـدا هـاتووە كـە بریتییـە ((لـە كردارێكــی ســتراتیژی دارێــژراو لــەپێناو بــەرەو پــێش چــوونی ژیــانی ئــابووری و كۆمەڵایەتی و بنیادنانەوەی لادێكان و هاوكـاری كردنـی گوندنشـینانەوە دەبێـت، كـە ئەم ستراتیژییەش بۆ فراوانبوونی پەرەپێدانـە كـە هەریـەك لـە جووتیـارانی كۆمەڵگـە بچووكەكان دەگرێتەوە))[١٨].

هــەروەها (پ. د. خــەلیل ئیســماعیل) بــەم شــێوەیە چــەمكی ((پەرەپێــدانی لادێیــی)) روونكردۆتــەوە، بــەوەی ئــەو پرۆســەیە كۆمــەڵێك كــردارە كــە پلانــی بــۆ دادەڕێژرێت، بە ئامانجی گۆڕانی كۆمەڵایەتی دیار لە كەرتی لادێدا، یاخود بریتییە لـە پرۆسەی نەخشە بـۆ دارێـژراو بـۆ روودانـی پەرەسـەندنی كۆمەڵایـەتی و ئـابووری لـە كۆمەڵگەی لادێییدا[١٩].

لە چەمكێكی دیكەدا هاتووە (پەرەپێدان كۆمەڵە كردارێكـە كـە، پـلان دارشـتن بەرێوە دەچێت، لـەپێناو سەرخسـتنی پلانەكەشـی پێویسـتی بەئـەركی هاووڵاتیـان و حكومەتەوە دەبێت)[٢٠].

لە راڤەیەكی تردا هاتووە  بریتییە لـە كـرداری باشـتركردنی دۆخـی ئـابووری و رۆشنبیری لە (كۆمەڵگە ناوخۆییەكاندا)[٢١].

لە رۆشنایی دید و تێڕوانینەكانی پێشوو دەگەینە ئـەو راسـتییە: كـە مەبەسـت لە پەرەپێدانی  لادێیی كۆمەڵێك پرۆسەی بەرنامە بۆدارێژراوە كە ئامانج لەم پرۆسانە رێكخستنی رەوشی ژیـانی دانیشـتوانی لادێكـان و پێشخسـتنی، هەلومـەرجی ژیـان و باشتركردنی  بوارەكانی ئابووری و كۆمەڵایەتیو تەندورستییە لە ژینگەی لادێییدا.

## بەشی دووەم:

## توانستە سروشتییەکانی پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەی شەمامك

هەڵبەت ئەو توانستە سروشتییانەی کە لەناوچەی لێکۆڵینەوەدا هەن وەك (بەرزی و نزمی، خاك، ئاوو هەوا، دەرامەتی ئاو). بەبنەمایەکی گرنگی پەرەپێدانی لادێیی دادەندرێت، چونکە هەر یەکێك لەم توانستانە بەتەنیا رۆڵی خۆی لە پرۆسەی پەرەپێدان و بەرەو پێش چوونی لادێیی دەنوێنێت، بۆ کاریگەری ئەرێنی هەریەك لەم توانستانە جیاوازە لەگەڵ ئەوی تر، لەپێناو بەرجەستەکردنی رۆڵ و کاریگەری توانستە سروشتییەکانیش لەسەر پرۆسەی پەرەپێدانی لادێ لە ناحیەی شەمامك بەجیا رۆشنایی دەخەینە سەر باسکردنی رۆڵی هەریەك لەم توانستانە بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- بەرزی و نزمی:**

بەسەرنجدان لە (نەخشەی-٢) دەردەکەوێت بەرزی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە ئاستی رووی دەریایەوە لەنێوان (٢٣٩-٤٥٠) مەتردایە ئەمەش ئەم راستییەمان بۆ دەردەخات، کە ناوچەکە لە رووی بەرز و نزمییەوە دەشتێکی تەختە بۆیە ئەم تایبەتمەندییەش یارمەتیدەر بووە بۆ سانایی بەکارهێنانی ئامرازە کشتوکاڵییەکان، لێرەوە پێویستە ئەو راستییە بخەینە روو کە ناوچەی لێکۆڵینەوە ناسراوە بەهەڵکەوتنی دەشتی فراوان و بەپیزی وەك (شەمامك) ئەم دەشتەش بەچەند تایبەتمەندییەك دەناسرێتەوە لەوانە خاکی بەپیتو قووڵ هەروەها دەوڵەمەندی بەسەرچاوەی ئاوی ژێرزەوی هەمووئەمانە بوونەتە فاکتەری یارمەتیدەر و هاندەری کارا بۆ دانیشتوانی ناوچەکە کە سوود لە بەکارهێنانی ئەم دەشتە وەربگرن بەتایبەتی بۆ چاندنی بەروبوومی کشتوکاڵی (دانەوێڵەو سەوزەوات) کە بەکۆڵەگەیەکی گرنگی پەرەپێدانی لادێیی دادەنرێت لە ناوچەکەدا.

**٢- خاك:**

خاکی ناوچەی لێکۆڵینەوە لەجۆری خاکی قاوەیییە، ئەم خاکەش بەوە جیا دەکرێتەوە کە برێکی گونجاو لە ماددەی کانزایی تێدایە کە گرنگە بۆ پێگەیشتنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان[٢٢]. بەسەرنجدان لە (خشتەی - ١-) دەردەکەوێت کە زیاتر لە (٥٥٪) خاکی ناوچەکە شیاوە بۆ کشتوکاڵکردن. هەروەها لە خشتەکەدا

تێبینی دەکرێت  کە ڕووبەری لەوەڕگای  سروشتی گەیشتۆتە نزیکەی (٣٧٪) کە دەتوانرێت سوودی لێ وەربگیرێت  بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ.

کـە ئەمــەش فاکتــەرێکی یامەتیـدەری گرنگـە بـۆ بـەخێوکردنی ئـاژەڵ و پەرەپێدانی بەروبوومی ئاژەڵی لە ناحیەکەدا، لـە ڕۆشـنایی باسـکردنی خـاك  بـەو ڕاسـتییە دەگـەین کـە بـەرزی ڕێـژەی بـەکارهێنانی خـاك بـۆ مەبەسـتی کشـتوکاڵ گەواهیدەرە لەسەر گونجاویی جۆری خاکەکە بۆ مەبەسـتی کشـتوکاڵکردن، ئەمـە وێڕای فراوانی  ڕووبەری لەوەڕگا بۆ مەبەستی بەخێوکردنی ئاژەڵ، ئەمـەش خـۆی لەخۆیـدا فاکتــەرێکی گرنگـە بـۆ پرۆسـەی پەرەپێـدانی بـەروبوومی کشـتوکاڵی، هەروەها پەرەپێدانی لادێیی لە ناوچەکەدا.

**( نەخشەی – ٢ )**

**بەرزی و نزمی  ناحیەی شەمامك**



**خشتەی -١-**

**رێژەی خاك لە ناحیەی شەمامك (٢٠١٤)**

| ناحیە | خاکی کشتوکاڵی (٪) | خاکی لەوەڕگاو پاوان (٪) | خاکی بەردەڵان (٪) |
|---|---|---|---|
| شەمامك | ٥٥,٤ | ٣٦,٩ | ٧,٧ |

**سەرچـاوە: ئامـادەکراوە پشتبەسـتن بـە: وەزارەتـی کشـتوکاڵ و سەرچـاوەکانی ئـاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، هۆبەی کشتوکاڵی شەمامك، بەشی زەوی و زار، ئاماری بڵاونەکراوە (٢٠١٤).**

**٣- ئاو و هەوا:**

ناوچەی لێکۆڵینەوە دەکەوێتە ریزی هـەرێمی ئاووهـەوای نیمچـە وشـك واتـە هاوینی گەرم و وشك و زستانی باراناوی، کە باران لە هەریەك لە وەرزەکانی (پـایز و زستان و بەهار) دەبارێت و هەڵبەت ئەم جۆرە کەشوهەوایە یارمەتیدەر دەبێت بۆ ئەنجامدانی چالاکی کشوکاڵ بەتایبەتی (سەوزەو دانەوێڵە) بۆزیاتر چـوونە نێـو باسـکردنی رەگـەزەکانی ئاووهـەوا بەتایبـەتی (بـاران) رۆشـنایی دەخەینـە سـەر ئەنجامی خشتەی باران لەماوەی (٢٠٠٩-٢٠١٤) لە ناوچەی لێکۆڵینەوەدا.

**خشتەی -٢-**

**سەرجەمی باران بارینی ساڵانە لە وێستگەی شەمامك لەماوەی (٢٠٠٩-٢٠١٤)**

| ساڵ | تێکرا (ملم) |
|---|---|
| ٢٠٠٩-٢٠١٠ | ٢٩٩ |
| ٢٠١٠-٢٠١١ | ٢٣٢,٧ |
| ٢٠١١-٢٠١٢ | ١٣٣,٥ |
| ٢٠١٢-٢٠١٣ | ٣٢٧,٢ |
| ٢٠١٣-٢٠١٤ | ٢٣٤,٧ |

**سەرچاوە/ کاری توێژەر پشتبەسـتن بـە: حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان، وەزارەتـی کشـتوکاڵ و سەرچـاوەکانی ئـاو، بەڕێوەبەرایـەتی کشـتوکاڵی هـەولێر، بەشـی کەشناسـی کشتوکاڵی، ئاماری تێکڕای باران لەوێستگەی (شەمامك) (داتای بڵاونەکراوە).**

**لە (تێبینی کردنی خشتەی -٢-) دەردەکەوێت کە سـەرجەمی بـاران بـارینی سـاڵانە لەناوچەی لێکۆڵینـەوە جیـاواز بـووە لەماوەیەکـەوە بـۆ ماوەیـەکی دی، بـەجۆرێك لـەماوەی**

**(٢٠١٢– ٢٠١٣) زۆرترین تێكڕای باران تۆماركراوە، كە زیاتر لە (٣٢٧)ملم بووە هەڵبەت ئەم بەرزییەش لەسەرجەمی باران یارمەتیدەر بووە بۆ برەودان بە ئەنجامدانی كشتوكاڵ و زیادبوونی بڕشت و بەروبووم و بەدەستهێنانی باشترین داهات بۆ جووتیار لەناحیەكەدا، كە لەم ساڵەدا داهاتی ساڵانەی جووتیار لەبەروبوومی دانەوێڵە بەراورد لەگەڵ ساڵانی رابردوو زیاتر بووە[٢٣].**

كە ئەمەش رۆڵێكی بەرچاوی لەسەر پرۆسەی پەرەپێدانی لادێی ناحیەی (شەمامك) نواندووە لەم ماوەیەدا. بەڵام كەمترین تێكڕای باران لەماوەی (٢٠١١– ٢٠١٢) بووە، كە نزیكەی (١٣٤)ملم، ئەم نزمبوونەوەیەش دەرئەنجامی بارودۆخی ئاوو هەوایە بەتایبەتی دروستبوونی دیاردەی شەختە لەكاتی گوڵكردنی گەنم بۆ نموونە لە (٤/١٠ تا ٤/٢٥) ئەم ماوەیە بەماوەی پیتاندنی دانەوێڵەی گەنم دەناسرێت بەڵام روودانی دیاردەی شەختە لەو ماوەیەدا ئاسەواری نەرێنی لەسەر بڕشتی بەرهەمهێنانی بەروبوومەكە دروست دەكات دواجار ئاراستەی بەرهەمهێنان بەئاراستەی كەمبوون دەڕوات، سەرباری بڵاوبوونەوەی هەندێ پەتای كشتوكاڵی وەكو (كەڕوو) كاریگەری هەیە لەسەر جۆرو بڕی بەرهەمهێنانی گەنم، لەلایەكی دیكەوە گۆڕانكارییە ئاو و هەواییەكان فاكتەرێكی دیكەن بەرپرسن لە كەمبوونەوەی تێكڕای باران بارین لەناوچەكەدا چونكە هاتنە ئارای هەلومەرجی وشكە ساڵی و دواكەوتنی باران راستەوخۆ كاریگەری خراپ لەسەر بڕ و جۆری بەروبوومی دانەوێڵە بەجێهێشتووە لەم ساڵەدا.

**٤– دەرامەتی ئاو[*]:**

سەرچاوەی ئاو لەناوچەی لێكۆڵینەوە بەشێوەیەكی سەرەكی بریتییە لە ئاوی ژێر زەوی ، ئەو سەرچاوەیەش وەك گرنگترین سەرچاوەی ئاوی لەلایەن دانیشتوانی ناوچەی لێكۆڵینەوە بەكاردەهێنرێت بۆ راییكردنی كارو چالاكییەكانی رۆژانەیان چ بۆ خواردنەوە یان بۆ مەبەستی ئاودێریكردنی كشتوكاڵ ئەمەو وێڕای سوود وەرگرتن لەم سەرچاوەیە بۆ مەبەستی بەخێوكردنی ئاژەڵ گرنگترین ئەو شێوەیەی ئاوی ژێر زەوی كە لەلایەن دانیشتوانی ناوچەی لێكۆڵینەوە سوودی لێ وەردەگیرێت بریتییە لە بیر:

ئەو بیرە ئاوانەی كە لەناحیەی شەمامك هەن و بەكاردێن بۆ مەبەستی ئاودێری و بەكارهێنانی مرۆڤ و ئاژەڵداری بەچەند شێوازێك هەن گرنگترینیان ئەمانەن:

**أ- بیری قووڵ:**

بەسەرنجدان (لەخشتەی -٣-)دا ژمارەو جۆری بیرە ئاوییەکان دەردەخات لەناوچەی لێکۆڵینەوە، بەشێوەیەك ژمارەی بیرە قووڵەکان لەسەر ئاستی ناحیەکەدا (١٠٨) بیری ئاوە، لەسەر ئاستی نشینگە گوندییەکانیش، زۆرترین ژمارەی بیری قووڵ کەوتۆتە گوندی (ماستاوە) کە بریتییە لە (٢٧) بیر، بەرزی ژمارەی بیرەکانی ئەم نشینگە گوندییە دەگەڕێتەوە بۆ بەرزی ژمارەی دانیشتوانو زیادبوونی پێویستییەکانیان بە ئاو بەتایبەتی بۆ ئاودانی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان، لەبەر نەبوونی سەرچاوەی ئاوی سەر زەوی راستەوخۆ پشت بەئاوی ژێر زەوی لەجۆری (بیر) دەبەستن، چ لەرێگای راکێشانی بۆری جۆگە لەژێر زەویدا بۆ ئاودانی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان یاخود بەکارهێنانی بیرە ئاوییەکان لەپرۆسەی ئاودان بەڕێگای پرژاندن و دلۆپاندن کە وەك یەکێك لە تەکنەلۆژیای تازە لە رۆژگاری ئەمڕۆ بەکارهێنانی باوە، ئەمەش ئەو راستییەمان بۆ دەسەلمێنێت کە بیرە ئاوییەکان لەدەڤەری لێکۆڵینەوە (١٠٠٪)ی پێویستی رۆژانەی دانیشتوانی ناوچەکەی لە سەرچاوەی ئاو پڕکردۆتەوە[٢٤].

هەروەك لە خشتەکەدا دەردەکەوێت هەریەك لەگوندەکانی (تەندوورە، قۆریتان چوکل) یەك لەدوای ژمارەی بیرە ئاوییەکانیان (١٦، ١١) بیر بووە، لەکاتێکدا کەمترین ژمارەی بیر کەوتۆتە هەریەك لەگوندەکانی (دۆغان، سیاو، سۆربەش حەوێز، سیراوە) کە لەیەك بیری ئاو زیاتر نەبووە، کە وەك سەرچاوەی گرنگ بەکاردێت بۆ پێویستی رۆژانە لەخواردنەوەو ئاودێریکردنی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان کە ئەمەش دواجار رۆڵی گرنگی هەبووە لەبووژانەوەی چالاکی ئابووری بەتایبەتی کشتوکاڵ لە ناحیەکەدا.

**خشتەی -٣-**

**بیرەکانی ناحیەی شەمامك**

| ناوی گوند | بیری قووڵ | بیری نیمچە قووڵ |
|---|---|---|
| دۆغان | ١ | ١٢ |
| دووسەرە جەبار | ٤ | ١٢ |
| دالّداغان | ٢ | ١٩ |

| | | |
|---|---|---|
| هێلەوە | ١٢ | ٤ |
| تەندوورە | ١٦ | ١ |
| تریەسپیان | ٢ | ٧ |
| كلیسە | ٣ | ٧ |
| عەلیاوە شێخان | ٤ | ٥ |
| سیاو | ١ | ٢٨ |
| سیراوە | ٤ | ٥ |
| سۆربەش حەوێز | ١ | ٢٠ |
| قۆریتان جوكل | ١١ | ٢ |
| قۆریتان مەلا مەحمود | ٢ | ١ |
| یدی قزلەر | ٥ | ١٦ |
| ئاودەلۆك | ٤ | ١١ |
| جدیدەلەك | ٢ | ٥ |
| رەختاوە | ٤ | ٢ |
| شێراوە | ١ | ١١ |
| گرد عازەبان | ٢ | ١٩ |
| ماستاوە | ٢٧ | ١٩ |
| سەرجەم | ١٠٨ | ٢٠٦ |

**سەرچاوە: كاری توێژەر پشتبەستن بە: وەزارەتی كشتوكاڵ و سەرچاوەكانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی كشتوكاڵی هەولێر، بەشی پلاندانان، ئاماری بیرەكانی ناحیەی شەمامك، (٢٠١٤) (داتای بڵاونەكراوە).**

**ب- بیری نیمچە قووڵ:**

ناحیەی شەمامك ژمارەیەكی بەرچاو لەم جۆرە بیرانەی تێدایە، هەروەك لە خشتەی پێشوودا تێبینی كرا، ژمارەی ئەم بیرانە لە ناوچەكەدا گەیشتۆتە (٢٠٦) بیر، ئەم بیرە ئاوییانەش بەشێوەی جیاواز بڵاوبوونەتەوە لەنێو نشینگە گوندییەكانی ناحیەكەدا، بەڵام یەكێك لە سیماكانی ئەم جۆرە بیرانە ئەوەیە كە توانای ئاودانیان كەمترە ئەگەر بەراورد بكرێن بەبیرە قووڵەكان بەڵام لەگەڵ

ئەوەشدا سوودی هەیە بۆ دانیشتوانی هەندێك نشینگە، بەتایبەتی سەنتەری ناحیەکە، ئەو ناوچانەی کە بیری قووڵی تێدا نییە، لەسەر ئاستی نشینگە گوندییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوەشدا، زۆرترین ژمارەی ئەو جۆرە بەر گوندی (سیاو) کەوتووە، ئەوەش لەبەر نەبوونی بیری قووڵ تێیدا، دانیشتوانی گوندی ئاماژە بۆکراو بۆ مەبەستی جێبەجێکردن و، راییکردنی کار و چالاکییەکانیان لە بەکارهێنانەکانی خواردنەوە و ئاژەڵداری و ئاودێری راستەوخۆ پشت بەو جۆرە بیرە ئاوییانە دەبەستن، لەدوای ئەو هەریەك لە گوندەکانی (داڵداغان، گردعازەبان، ماستاوە، سۆربەش حەوێز، یدی قزلەرە) یەك بەدوای یەك ژمارەی بیرەکانیان (١٩، ٢٠، ١٦) بیر بووە.

لە سۆنگەی باسکردنی دەرامەتە ئاوییەکان بەتایبەتی بیر دەگەینە ئەو پوختەیەی کە سەرچاوە ئاوییەکان لەشێوەی بیر سەرەڕای جیاوازی لە ژمارەو جۆریان لەسەر ئاستی ناحیەکە، بەڵام وەك یەکێك لە توانستە سروشتییەکان رۆڵیان لەجێبەجێکردنی چالاکی گوندنشینانی ناحیەکەدا هەیە، ئەم رۆڵەشیان لەمیانی بەکارهێنانیانەوە دێت لەبوارەکانی خواردنەوە و ئاودێریکردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، ئەمەش یارمەتیدەر بووە لەپێشخستنی پرۆسەی پەرەپێدانی دێ لەناحیەکەدا، لەکۆتایی ئەم بەشەی توێژینەوە.

لەکۆتایی ئەم بەشەی توێژینەوەدا ئەم بەشەی لێکۆڵینەوە دەگەینە ئەو پوختەیەی کە توانستە سروشتییەکان بەجیاوازی رۆڵیان بوونەتە فاکتەری یارمەتیدەری پەرەپێدانی لادێیی، لەسەر ئاستی ئەو توانستانەش بەرزی و نزمی و دەرامەتی ئاویی رۆڵیان بەڕوونی دیار و بەرچاو بووە لەپرۆسەی بووژانەوەو پەرەپێدانی کشتوکاڵی دواتر پەرەپێدانی لادێیی لەناوچەی لێکۆڵینەوەدا.

## بەشی سێیەم

## توانسته مرۆییەکانی پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەی شەمامك

توانسته مرۆییەکان، بەبنەمایەکی گرنگی پەرەپێدانی لادێیی دادەنرێت، چونکە گومانی تێدا نییە بەوەی چاکبوونی باری ئاسایی لە ناحیەکەدا هەلێکی باشی رەخساندووە بۆ سەرکەوتنی کردارەکانی پەرەپێدانی لادێیی تێدا، لەپێناو باسکردنی گەوهەری ئەم بەشە بەپێویستی دەزانین توانسته مرۆییەکانی پەرەپێدانی لادێیی لەناحیەی شەمامك بەم شێوەیەی خوارەوە رۆشنایی بخەینە سەر یەکەیەکەیان:

**یەکەم: گۆڕانی دانیشتوان:**

لەم تەوەرەدا هەوڵدەدەین لێکۆڵینەوە لەم گۆڕانانە بکەین کە بەسەر دانیشتوانی ناحیەی شەمامك هاتووە لەماوەی (٢٠٠٦–٢٠١٤) وەك لە(خشتەی – ٤) دەردەکەوێت کە دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە لەم ماوەیەدا هەڵبەزو دابەزینێکی دیار بە ژمارەکانیانەوە هاتۆتە ئاراوە، بەشێوەیەك لەساڵی (٢٠٠٦) ژمارەیان گەیشتۆتە (٢٠٦٣٦) کەس کەچی ئەم ژمارەیە بەڕێتمی کەمبوون هەنگاوی ناوە لەساڵی (٢٠٠٩) کە گەیشتوونە بە (١٧٦٢٠) کەس، هەڵبەت ئەم جیاوازییەش لەماوەی ئاماژەی بۆکراودا دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی پێگەی جوگرافی ناحیەکە لە سەنتەری شاری هەولێر، کە هاندەر بووە بۆ دانیشتوانی ناحیەکە بەوەی روو لە شار بکەن، بۆ ئاسانی راییکردنی کارو چالاکییەکانیان، بەڵام لەساڵی (٢٠١٣) ژمارەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بەشێوەی سەرنجراکێش رووی لە هەڵکشان بووە، کە گەیشتۆتە (٣٢٦٩٠ کەس)، بەڵام ساڵی (٢٠١٤) ژمارەی دانیشتوانی ناحیەکە گەیشتۆتە (٣٣٢١٢) کەس. هۆی ئەم زیادبوونەش دەگەڕێتەوە بۆ هاتنی ژمارەیەکی بەرچاوی ئاوارەکانی هەریەك لە ناوچەکانی (مووسڵو گوێر)(*). بۆ ناحیەکە کە ژمارەیان گەیشتۆتە (٢٣٠٠) کەس[٢٥].

**خشتەی (٤)**

**دانیشتوانی ناحیەی شەمامك لەماوەی (٢٠٠٦– ٢٠١٤)**

| ساڵ | دانیشتوان |
|---|---|
| ٢٠٠٦ | ٢٠٦٣٦ |
| ٢٠٠٩ | ١٧٦٢٠ |
| ٢٠١٣ | ٣٢٦٩٠ |
| ٢٠١٤ | ٣٣٢١٢ |

**سەرچاوە: وەزارەتی ناوخۆ، پارێزگای هەولێر، بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی شەمامك، بەشی ئاماری دانیشتوان، ئاماری دانیشتوانی ناحیەی شەمامك (٢٠١٤) بڵاونەكراوەتەوە.**

**دووەم: چالاكییە ئابوورییەكان:**

**أ– كشتوكاڵ:**

ناوچەی لێكۆڵینەوە یەكێكە لە بەناوبانگترین ناوچە كشتوكاڵییەكان لەسنووری پارێزگای هەولێر، كە بەپلەی یەكەم بۆ بەروبوومی دانەوێڵە (گەنم، جۆ) هەروەها بەپلەی دووەم شیاوە بۆ چاندنی بەروبوومی سەوزەی زستانەو هاوینە، لەپێناو پەرەپێدانی كشتوكاڵیش بەهەر دوو بەشەكەیەوە (بەرهەمهێنانی رووەكی و سامانی ئاژەڵی)، پێویستە هەموو ئەو ئامرازو ئامێرانە فەراهەم بن كە لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا سوودیان لێ وەردەگیرێت، تاوەكو ببێتە كۆڵەگەیەكی بەهێز بۆ جووتیاران لەپرۆسەی پێدانی لادێیی لە ناحیەكەدا.

لێرەدا رۆشنایی دەخەینە سەر باسكردنی گرنگترین بەرهەمە كشتوكاڵییەكانی ناوچەی لێكۆڵینەوە كە بریتین لە:

١– بەرهەمی دانەوێڵە

٢– بەرهەمی پاقڵە

٣– بەرهەمی سەوزەوات

**١- بەرهەمی دانەوێڵە:**

چاندنیان باوە لە ناوچەی لێكۆڵینەوەدا، چونكە سروشتی خاكەكە و هەلومەرجی ئاووهەوای ناوچەكە یارمەتیدەر بووە لە پیادەكردنی چاندن و بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە بەروبوومە، هەڵبەت بەرهەمی دانەوێڵەش كۆمەڵێ

دانەوێڵەی هەمەچەشن دەگرێتەوە کە هەندێکیان وەك (گەنم) بەخۆراکی سەرەکی دانیشتوانی قەزای ناوەندی هەولێر بەگشتی و ناحیەی شەمامك بەتایبەتی ناحیەکە دادەندرێت، هەندێکی تریشیان وەك کەرستەی ئالیك بەکاردێن بۆ مەبەستی ئاژەڵداری.

**لێرەدا رۆشنایی دەخەینە سەر باسکردنی گرنگترین جۆری ئەم بەروبوومانە:**

**أ- گەنم و جۆ:**

بریتین لە بەروبوومە دانەوێڵەیییەکان کە چاندنی باوە لە وەرزی زستاندا، چاندنیان لە دەشتی شەمامکدا لەپێشەنگی بەرهەمە زستانییەکانی دیکەوە دێت، وەرزی چاندنی هەریەك لە (گەنم) و (جۆ) لەکۆتایی مانگی تشرینی یەکەمەوە دەست پێدەکات، لەکۆتایی مانگی ئایار پێدەگات و دەدوورێتەوە بەسەرنجدان لە (خشتەی -٥-) دەردەکەوێت کە رووبەری چاندراو بە بەروبوومی گەنم ساڵی (٢٠٠٩-٢٠١٠) گەیشتۆتە (٦٢٠٠٠) دۆنم، لەکاتێکدا ساڵی (٢٠١٠- ٢٠١١) گەیشتۆتە (٩٢٣١٣) دۆنم، ئەم زیادبوونەش لە رووبەری چاندراو بەم بەروبوومە دەگەڕێتەوە بۆ باشتربوونی هەلومەرجی ئاووهەوا چونکە وەك ئاشکرایە کە دیاردەی وشکەساڵی لە ساڵی (٢٠٠٧)ەوە دوایدا باڵی کێشابوو بەسەر ئاووهەوای هەرێمی کوردستان، بۆیە نەمانی دیاردەکە یارمەتیدەر بووە بۆ زیادبوونی رووبەری چاندراو بەدانەوێڵەی گەنم، کەچی ساڵی (٢٠١٢- ٢٠١٣) زۆرترین رووبەری چاندراوبووە لەناوچەی لێکۆڵینەوەدا، کە بریتی بووە لە (١٤٠١٠٠) دۆنم، ئەم زیادبوونەش لە رووبەری چاندراو بەگەنم زادەی ئەو هاوکارییەی حکومەت دێت، کە پێشکەشی جووتیارانی ناحیەکەی کردبوو، لە تۆی کشتوکاڵی و (پەینی کیمیاوی) کە بێگومان ئەو هاوکاریکردنەش هاندەر دەبێت بۆ جووتیار کە رووبەرێکی زیاتر تەرخان بکات بۆ چاندنی بەروبوومی زستانەی دانەوێڵەی (گەنم)[٢٦]. بەڵام ساڵی (٢٠١٣- ٢٠١٤) وەك لەخشتەی پێشوودا بەرچاوکەوت رووبەری چاندراو گەیشتۆتە (٧٥٩٠٢) دۆنم، بەتێچوونێکی کەم برێکی زۆری دانەوێڵەی (گەنم) بە حکومەت دەفرۆشرا واتە داهاتی ئەم ساڵەی جووتیار بۆ ئەم جۆرە بەروبوومە کەم بووە. جگە لە دانەوێڵەی گەنم هەروەها بایەخ بەچاندنی بەروبوومی دانەوێڵەی (جۆ) دراوە لە ناحیەکەدا، بەجۆرێك زۆرترین رووبەری

چاندراو به‌به‌روبوومی ئاماژه‌ بۆكراو لـه‌ماوه‌ی (٢٠١٠–٢٠١١) گه‌یشـتۆته‌ (٥٢٣٤٧) دۆنم، واته‌ به‌بـه‌روارد له‌گـه‌ڵ سـاڵانی پێشـوو رووبـه‌ری چـاندراو زیـادی كـردووه‌، هه‌ڵبه‌ت ئـه‌م زیادبوونـه‌ش ده‌گه‌ڕێتـه‌وه‌ بـۆ زیـادبوونی پێویسـتی جووتیـاران بـه‌م به‌روبوومه‌ كه‌ وه‌ك ئالیك بۆ ئـاژه‌ڵ بـه‌كارده‌هێنن، بـه‌ڵام هـه‌روه‌كو له‌خشـته‌كه‌دا تێبینی ده‌كرێت رووبه‌ری چاندراوی بـه‌روبوومی (جـۆ) له‌ناوچـه‌كه‌دا له‌سـاڵانی دی به‌ڕێتمی كه‌مبوون رۆیشتووه‌ ئه‌مه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ كه‌مبوونی داهاتی جۆ به‌به‌روارد له‌گه‌ڵ داهاتی گه‌نم، ئه‌مه‌ش كاری كردۆته‌ سـه‌ر كـه‌مبوون‌و زیـادبوونی رووبـه‌ری چاندراوی له‌ماوه‌ی لێكۆڵینه‌وه‌دا.

لـه‌ رۆشـنایی ئـه‌وه‌ی بـاس كـرا ده‌گه‌ینـه‌ ئـه‌وه‌ی كـه‌ به‌رهـه‌می دانه‌وێڵـه‌ سه‌ره‌ڕای بوونی هه‌ڵبه‌زو دابه‌زین له‌ رووبـه‌ری چـاندراوی لـه‌ماوه‌ی لێكۆڵینـه‌وه‌دا به‌ڵام وه‌ك یه‌كێك له‌به‌روبوومـه‌ سـه‌ره‌كییه‌كانی ناوچـه‌كه‌ بایـه‌خ به‌چـاندنی دراوه‌، له‌سـه‌ر ئاسـتی ئـه‌و به‌روبوومـه‌ش گـه‌نم پێشـه‌نگ بـووه‌، كـه‌ پێویسـتییه‌كانی جووتیـاری وه‌ك خـۆراكێكی سـه‌ره‌كی رۆژانـه‌ جێبـه‌جێ كـردووه‌ لـه‌پاڵ ئه‌مـه‌ش به‌شداربووه‌ له‌ به‌دیهێنانی داهاتێكی به‌رز بۆ جووتیار كـه‌ ئـه‌وه‌ش دواجـار كـاری كردۆته‌ سه‌ر وه‌به‌رهه‌مهێنانی ئابووری لـه‌ ناوچـه‌كه‌ پاشـان په‌ره‌پێـدانی لادێیـی تێیدا.

**خشته‌ی –٥–**

**رووبه‌ری چاندراوی به‌روبوومی زستانه‌ به‌ دۆنم**

**له‌ ناحیه‌ی شه‌مامك له‌ماوه‌ی (٢٠٠٩–٢٠١٤)**

| به‌روبوومی<br>ساڵ | گه‌نم<br>(دۆنم) | جۆ(دۆنم) | نۆك(دۆنم) | نیسك(دۆنم) | كۆی<br>گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٩–٢٠١٠ | ٦٢٠٠٠ | ٦٤٠٠٠ | ١١ | ٦ | ١٢٦٠١٧ |
| ٢٠١٠–٢٠١١ | ٩٣٣١٣ | ٥٢٣٤٧ | ١٧ | ٢٥ | ١٤٥٧٠٢ |
| ٢٠١١–٢٠١٢ | ٥٩٧٩١ | ١٢٠٠٠ | ٦ | ٦ | ٧١٨٠٣ |
| ٢٠١٢–٢٠١٣ | ١٤٠١٠٠ | ٣٧٠٠١ | ٣٢ | ٦ | ١٧٧١٣٩ |
| ٢٠١٣–٢٠١٤ | ٧٥٩٠٢ | ١١٧٠٠ | ٣٥ | ٧ | ٥٢٠٣٦١ |

**سه‌رچاوه‌: كاری توێـژه‌ر پشتبه‌سـتن بـه‌: وه‌زاره‌تـی كشـتوكاڵ‌و سه‌رچـاوه‌كانی ئـاو، به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی كشتوكاڵی هه‌ولێر، به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی پلانـدانان و به‌دواداچـوون، به‌شـی پلاندانان، راپۆرتی كۆتایی چاندنی (به‌روبوومی دانه‌وێڵه‌) (٢٠١٤) (داتای بڵاونه‌كراوه‌).**

### ٢- بەرهەمە پاقلەییەکان:

بەپلەی سێیەم دێن لەدوای دانەوێڵەی (گەنم و جۆ) کە هەریەك لە (نۆك- نیسك) دەگرێتەوە، وەك لە (خشتەی-٦-) تێبینی دەکرێت بەجۆرێك رووبەری چاندراو بەهەر یەك لەم دوو بەروبوومە جیاواز بووە لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دی، ئەمەش بەگوێرەی پێویستی داواکاری دانیشتوانی ناحیەکە پەیوەست بووە، رووبەری چاندراو بەروبوومی (نۆك) لەساڵی (٢٠١٤) گەیشتۆتە (٣٥) دۆنم بەبەرارود لەگەڵ ساڵانی پێشوو، بۆیە دەردەکەوێت لەم ساڵەدا پێویستی دانیشتوان بەم بەروبوومە زیاتر بووە چ بۆ پڕکردنەوەی پێویستی ناوخۆ یان ناردنی بەرهەمەکە بۆ بازاڕ. هەرلەسەر ئاستی بەروبوومە پاقلەییەکان لە خشتەکەدا سەرنج دەدرێت لەسەر ئاستی ماوەکان تەنیا لەساڵی (٢٠١١) رووبەری چاندراوی ئەم بەروبوومە گەیشتۆتە (٢٥) دۆنم واتا زیاتر بووە بەبەروارد لەگەڵ ساڵانی تر ئەمەش بۆ پێویستی داواکاریی خەڵك دەگەڕێتەوە بۆ بەروبوومی ناوبراو سەرەڕای ئەوەش پاش دوورینەوەی بەروبوومەکە بریتی بوو لە (١٤٠١٠٠) دۆنم،

**خشتەی -٦-**

**بڕشتی بەرهەمهێنانی بەروبوومی زستانە (کغم/ دونم)**

**لە ناحیەی شەمامك لەماوەی (٢٠٠٩- ٢٠١٤)**

| دانەوێڵە | گەنم | جۆ | نۆك | نیسك |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٩- ٢٠١٠ | ٢٣٧٤٦ | ٢٠٠٩٦ | ٢,٢ | ١,٤ |
| ٢٠١٠- ٢٠١١ | ٢٣٩٨١ | ١٢٠٣٩ | ٤ | ٦,٧ |
| ٢٠١١- ٢٠١٢ | ٩٥٦٥ | ١٢٦٠ | ٠,٨ | ١,١ |
| ٢٠١٢- ٢٠١٣ | ٥٦٠٤٠ | ١٣٨٧٥ | ٨ | ١,٥ |
| ٢٠١٣- ٢٠١٤ | ٢٧٠٩٧ | ٣٦٥٤ | ٣,٧ | ١,٧ |

**سەرچاوە: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، بەشی پلاندانان بەدواداچوون ئاماری بڕشتی بەرهەمهێنانی بەروبوومی زستانە، لە ناحیەی شەمامك ساڵانی (٢٠٠٩- ٢٠١٤) داتای بڵاونەکراوە.**

لەکاتێکدا بڕشتی بەرهەمهێنان گەیشتۆتە (٥٦٠٤٠) تەن، وەك لەخشتەی -٦- تێبینی دەکرێ لەکاتێکدا دانەوێڵەی (جۆ) لەماوەی (٢٠١٢- ٢٠١٣) بڕشتی بەرهەمهێنانی گەیشتۆتە (١٣٨٧٥) تەن واتە لەم ماوەیەدا لە رووبەری (٣٧٠٠١) دۆنمدا هۆیەکەی لەناوەرۆك نووسراوە.

پووش و پەڵاشەکەی وەك ئالیك بەکاردێت بۆ ئاژەڵ، بەبەراورد لەگەڵ بەروبوومی دانەوێڵەی (جۆ) تێبینی ئەوە دەکرێت لەخشتەکەدا رووبەری چاندراو بەبەرهەمە پاقلەییەکان لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر گۆڕانی دیاری بەسەردا هاتووە ئەم گۆڕانەش بەئاراستەی کەمبوون بووە، هەڵبەت ئەم کەمبوونەش لە رووبەری چاندراو بەبەروبوومە پاقلەییەکان ئەنجامی ئەو هەلومەرجە ئاووهەوایەیە بووە کە ناوچەی لێکۆڵینەوە دووچاری بووە، لە رووی کەم بارانی و وشکە ساڵییەوە، ئەمە سەرەڕای کەمی نرخی هەریەك لەم بەروبوومانە لە بازاڕدا و متمانەی دانیشتوان بۆ بەرهەمەکانی دەرەوەی هەرێم، وای لە جووتیارانی ناحیەکە کردووە کە رووبەرێکی کەمتر تەرخان بکەن بۆ چاندنی بەروبوومە پاقڵەییەکان، بۆیە گرنگە حکومەت بایەخ بەکڕینەوەی بەرهەمی خۆجێیەتی جووتیاران بدات لەبری ئەوەی کە سوود لە بەرهەمەکانی دەرەوە وەربگرێت، چونکە متمانەکردن لەسەر بەرهەمی خۆجێیەتی لەدوو روانگەوە سوود بەخشە لەلایەکەوە یارمەتیدەر دەبێت بۆ زیادبوونی داهاتی ئابووری جووتیاران و هاندەریشە لەسەر چاندنی رووبەرێکی فراوان بەبەروبوومە پاقلەییەکان، لەلایەکی دیکەوە فاکتەرێکی بەهێزە بۆ خستنەسەر پێی ئابووری لەناوچەکە کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا یارمەتیدەرێکی گرنگ دەبێ بۆ وەبەرهێنانی ئابووری پاشان پەرەپێدانی لادێیی لە ناوچەکەدا.

**٣- بەرهەمی سەوزە: بریتییە لە دوو لق:**

**أ- سەوزەی هاوینە:**

بریتین لە کۆمەڵێك جۆری سەوزە کە لەم وەرزەدا چاندنیان باو دەبێت، ئەگەر تیشك بخەینەسەر رووبەری چاندراوی هەریەکێك لەم بەروبوومانە لەناوچەی لێکۆڵینەوەدا، ئەوا رووبەری هەر بەرهەمێك جیاوازە کە تەرخانکراوە بۆ چاندنی

بەگوێرەی گرنگیی هەریەکێك لەم بەرهەمانە لە رووی خۆراکەوە، بە (سەرنجدان لە خشتەی -٧-) ئەم راستییە دەردەکەوێت بەوەی رووبەری چاندراو بە بەروبوومی (تەماتە) لە ناوچەکەدا لەپێشەنگی هەموو بەرهەمە کشتوکاڵییە هاوینییەکانەوەیە، کە گەیشتۆتە (٤٥٠٠) دۆنم لەماوەی (٢٠٠٩-٢٠١٠) لەکاتێدا رووبەری چاندراو بەهەمان بەروبووم ساڵی (٢٠١١) گەیشتۆتە (٦٠٠٠) دۆنم، بەڵام ساڵی (٢٠١٣) رووبەری چاندراو لە تەواوی ماوەکانی لێکۆڵینەوە بریتی بووە لە (٤٢٠٠) دۆنم، بەرزی رووبەری چاندراو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە جووتیار هەمیشە ئەو بڕۆکەیە لەچاندن پەیڕەو دەکات کە زیاتر ئەو بەروبوومە بچێنێت بەهۆی زۆرترین قازانج و کەمترین تێچوون بەدەست بهێنێت، کەواتە بەروبوومی (تەماتە) یەکێکە لەو جۆرانەی کە بایەخ بەچاندنی دراوە لەلایەن گوندنشینانی ناحیەکە کە پرۆسەی بازارکردنی ئەم بەروبوومە پێویستی بەماندووبوونێکی کەم هەیە بۆیە زۆرترین داواکاری هەیە لەبازاڕو لەلایەن جووتیار بایەخی بەرچاو بەچاندنی دراوە بۆیە یارمەتیدەرێکی گرنگ بووە بۆ پرۆسەی وەبەرهێنانی کشتوکاڵی و پەرەپێدانی لادێیی لەناحیەکەدا، جگە لەوەی لەبەرهەمە کشتوکاڵییە سەرەکییەکانی ناوچەکە دادەنرێت پێویستییە خۆراکییەکانی گوندنشینانی پڕکردۆتەوە جیا لەوەش لەمیانی فرۆشتنی بەرهەمی ناوبراودا جووتیار داهاتێکی گونجاو بەدەست دێنێت ئەمەش خۆلەخۆیدا رۆڵی لەپرۆسەی پەرەپێدانی ئابووری لە ناحیەی شەمامکدا هەبووە.

**خشتەی -٧-**

**رووبەری سەوزەی هاوینەی چاندراو لە ناحیەی شەمامك لەماوەی (٢٠٠٩-٢٠١٣)**

| بەروبووم ساڵ | تەماتە (دۆنم) | خیار(دۆنم) | باینجان(دۆنم) | کودی(دۆنم) | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٠ | ٤٥٠٠ | ٣٤٤٠ | ١٣٠٠ | ٧٥ | ٩٣١٥ |
| ٢٠١١ | ٦٠٠٠ | ٤٠٠٠ | ٧٠٠ | ١٥٠ | ١٠٨٥٠ |
| ٢٠١٣ | ٥٢٠٠ | ٣٠٠٠ | ٦٥٠ | ١٥٠ | ٩٠٠٠ |
| ٢٠١٤ | ٤٢٠٠ | ٦٥٠٠ | ٨٠٠ | ١٥٠ | ١١٦٥٠ |

**سەرچاوە: وەزارەتی کشتوکاڵو سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، بەشی پلاندانان، ئاماری بەروبوومی سەوزەی هاوینە (داتای بڵاونەکراوە).**

**- سەوزەی زستانە:**

كۆمەڵێك سەوزە دەگرێتەوە كە سوود لە لاسك یان گەڵا یاخود رەگەكانیان دەبینـدرێ، بایـەخی خۆراكییـان كـەمتر نییـە لـە بایـەخی سـەوزە هاوینییـەكان ئـەوانیش وەك (سـڵق، پیـازی تـەڕ، پاقلـە) بـەتێڕامان لـە (خشـتەی - ٨-) دەردەكەوێت كە رووبەری چاندراو بە بەروبوومی سەوزەی زستانە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەجۆرێك زۆرترین رووبەری چاندراو بەروبوومی جۆری (پیازی تـەڕ) بـووە كە رووبەرەكەی گەیشتۆتە (٤٠٠) دۆنم لەساڵی ٢٠١٣دا، هەڵبەت ئەم زیادبوونـەش دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی داواكاری و ئارەزووی دانیشتوانی ناحیەكـە كـە یـەكێك لە خۆراكەكانی رۆژانـە بـەكاری دەهێـنن، وێـڕای نـاردنی بەروبوومـەكان بـۆ بـازاڕ، لەدوای ئەم بەروبوومە لەخشتەكەدا دەردەكەوێت یەك لەدوای یەك بەروبوومەكانی (پاقلە، سلق) رووبەری چـاندراویان گەیشـتۆتە (٢٥٠) دۆنم و (٢٠٠) دۆنم، ئەمـەش ئەم راستییە دەداتە دەستەوە كە لەم ساڵەدا جووتیـار ئـارەزووی زیـاتر بـووە بـۆ چاندنی بەروبوومەكانی ناوبراو لەبـەر زیـادبوونی بـەكاربردنیان لـەبازاڕو سـەرباری فەراهەمبوونی ئامرازی كشتوكاڵی زیاتر بەبەراورد لەگەڵ ساڵانی پێشوو، ئەمـەش فاكتەرێكی یارمەتیدەر بـووە بـۆ زیـاتر برەودانـی بەكشـتوكاڵ كردنـی بـەروبوومی زستانە لە ناحیەكەدا و هـەروەها كۆڵەگەیـەكی بەهێزیشـە بـۆ پـەرەپێدانی لادێیـی لەناوچەكەدا.

لە رۆشـنایی ئـەم تـەوەرەدا دەگەینـە ئـەو راسـتییەی كـە كشـتوكاڵ، وەك یـەكێك لـە توانسـتە ئابوورییـەكان رۆڵـی دیـاری لەپرۆسـەی پەرەپێـدانی لادێیـی نوانـدووە، هەڵبـەت ئـەو رۆڵەشـی لـەمیانی بایەخـدان دێـت بـەم بەروبوومانـەی لەلایـەن گوندنشـینانی ناحیەكـەوە داواكـاری لەسـەر زۆر بـووە هـەروەها سەرچاوەیەكی گرنگیش بووە بۆ زیادبوونی داهاتیان.

**خشتەی -٨-**

**رووبەری چاندراوی بەروبوومی سەوزەی زستانە لەماوەی (٢٠٠٩-٢٠١٣) بە(دۆنم)**

| ناوی بەروبووم ساڵ | پیازی تەڕ (دۆنم) | پاقلە (دۆنم) | سڵق(دۆنم) | كۆی گشتی (دۆنم) |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٩ | ٢٠ | ٣٠ | ١٠ | ٦٠ |
| ٢٠١٠ | ٣٠٠ | ٦٠ | ٢٠٠ | ٥٦٠ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٠١١ | ٢٠٠ | ٤٠ | ١٠٠ | ٣٤٠ |
| ٢٠١٢ | ٣٠٠ | ٢٠٠ | ٢٥٠ | ٧٥٠ |
| ٢٠١٣ | ٤٠٠ | ٢٥٠ | ٢٠٠ | ٨٥٠ |
| کۆی گشتی | | | | ٢٥٦٠ |

**سەرچاوە: کاری توێژەر پشتبەستن بە: وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، بەشی پلاندانان و بەدواداچوون، سەرچاوەی پێشوو.**

**ب- ئامرازی کشتوکاڵ**

لەتێبینیکردنی (خشتەی-٩-) ئەو راستییانەی خوارەوە دەخەینە روو:

أ- لە ساڵی (٢٠١٤)دا (١٣٧) خانووی پلاستیکی لە ناحیەکەدا هەبووە کە جووتیارانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بۆ بەرهەمهێنانی بەروبوومی رووەکی سوودی لێوەردەگرن، لەم ژمارەیەدا (٢٧) خانوو لەلایەن وەزارەتی کشتوکاڵو ئاودێرییەوە بە بەهایەکی کەم بەجووتیارانی ناحیەکە فرۆشراوە، بەڵام (١١٠) خانووەکەی دی جووتیار لەسەر ئەرکی ماددی خۆی هەڵساوە بەکڕینیان، پێویستە لەم روانگەیەوە زیاتر بایەخ بدرێ بەپێدانی خانووی پلاستیکی بۆ جووتیاران لەلایەن وەزارەتی کشتوکاڵەوە لەبری ئەوەی کە جووتیار لەسەر ئەرکی خۆی هەڵسێ بەدابینکردنیان، چونکە هەماهەنگی کردنی جووتیار لەم رووەوە یارمەتیدەرێکی بەهێزە بۆ بەرهەمهێنانی بڕ و جۆری باشتری بەروبوومی رووەکی، هەروەها دەبێتە فاکتەرێك بۆ زیادبوونی داهاتی جووتیارانو هاوکات ساغکردنەوەی ئەم بەروبوومە رووەکییانە لەبازاڕی خۆجێیەتی لەبری ئەوەی متمانە بکرێتە سەر بەروبوومی بیانی، هەڵبەت بەدیهێنانی ئەم وتەیەی سەرەوەش دەبێتە هاندەرێکی بەهێز بۆ بووژانەوەی کەرتی ئابووری هەروەها پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەکەدا.

ب- هەروەك لە خشتەکە تێبینی دەکرێت لەناوچەی لێکۆڵینەوە (٦٥٠) تراکتۆر هەیە، کە زۆربەیان بەسەر سەنتەری ناحیە و گوندەکانی ناحیەی شەمامکدا دابەش بوون، هەڵبەت بوونی ئەم ئامرازە دەگەڕێتەوە بۆ گواستنەوەی ئاو و کەرستە و پێویستییە بیناسازییەکانی ناوچەکە، چونکە ناوچەکە جیا لەوەی

ناوچەیەکی کشتوکاڵییە هەروەها ژمارەیەکی بەرچاو کارگە و پیشەسازی تێدا چڕبۆتەوە.

**خشتەی -٩-**

**سامانی ئاژەڵی و پرۆژەی پەلەوەر لەناحیەی شەمامك ساڵی ٢٠١٤**

| ساڵ | ژ.مەڕ | ژ. ڕەشەوڵاخ | ژ. بزن | پرۆژەی پەلەوەر | حەوزی ماسی |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠١٤ | ٤٥٠٠٠ | ٢٥٨٠ | ١٦٠٠٠ | (٤٥٠-٥٠) | ١٤ |

**سەرچاوە: (ئاماری ئاژەڵو پرۆژەی پەلەوەر، ساڵی ٢٠١٤ داتا) بڵاونەکراوە.**

**خشتەی -١٠-**

**ئامرازە کشتوکاڵییەکان لەناحیەی شەمامك ساڵی ٢٠١٤**

| ئامراز | تراکتۆر | خانووی پلاستیکی | دەراسە |
|---|---|---|---|
| ژمارە | ٦٥٠ | ١٣٧ | ٧١ |

پ- لە ناوچەکەدا (٧١) دەڕاسە هەیە، بێگومان ئەمەش وەك ئامرازێکی کشتوکاڵی گرنگ لەوەرزی دروێنەکردن بەکاردێت لەلایەن جووتیارانی ناوچەکە، سەبارەت بەسامانی ئاژەڵ وەك لەنەخشەی (٩) تێبینی دەکرێت لەناحیەی شەمامك زیاتر بایەخ دەدرێت بەبەخێوکردنی جۆری ئاژەڵەکانی (مەڕ، بزن، ڕەشەوڵاخ). بەشێوەیەك:

- لەساڵی (٢٠١٤) ژمارەی (مەڕ) (٤٥٠٠٠) سەر بووە.
- لەساڵی (٢٠١٤)دا ژمارەی (بزن) (١٦٠٠٠) سەر بووە.
- سەبارەت بەژمارەی ڕەشەوڵاخ لەهەمان ساڵ بریتی بووە لە (٢٥٨٠) سەر.

بایەخدان بەبەخێوکردنی هەریەك لەم ئاژەڵانە و بەم ژمارەیەی کە ئاماژەیان بۆ کرا لەلایەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گوندنشینانی قەزاکە وەك پێویستییەك بۆ پڕکردنی بژێوی ژیانیان لە (ماست، شیر و بەرهەمەکانی) دی سوودی لێ وەردەگرن، کە لەپاڵ بەکارهێنانی ئەم کەرستانە بەشێك لە بەروبوومەکانی ئاژەڵ ڕۆژانە لەبازاڕەکانی (شاری هەولێر) بەتایبەتی (گومرگ) ساغ دەکرێتەوە، بەتایبەتی لەکاتی ئێستادا کە سەرەتای بەهارە ڕەواجی زۆر بەبەرهەمەکانی شیرەمەنی ناحیەی (شەمامك) دەدرێت لەگومرگدا هاوڵاتیان

داواکارییــان لەســەر ئــەم بەرهەمانــە فرەیــە و زۆرە بــەجۆرێك داهــاتی رۆژانــەی جووتیـارانی ناحیەکـە لـەم بەروبوومانـە لـە (٧٠٪) کـەمتر نییـە[٢٧]. هەڵبـەت ئـەم ڕێژەیەش فاکتەرێکی یارمەتیدەری باش و هانـدەرە بـۆ جووتیـارانی ناوچـەکە کـە زیاتر بایەخ بدەن بەبەخێوکردنی ئەم ئاژەڵانـەی پێشـوو، ئـەوەش خـۆی لەخۆیـدا دەبێتــە کۆڵەگەیـەکی بـەهێز بـۆ پرۆسـەی وەبـەرهێنانی ئـابووری و پەرەپێـدانی لادێیی لە ناحیەکەدا.

ت- ســـەبارەت بـــەهۆڵی پەلـــەوەر (٤٥) هـــۆڵی بـــەخێوکردنی پەلـــەوەر لەناحیەکەدا هەیە، حەوزی ماسی گەیشتۆتە (١٤) حەوز، سـەبارەت بـە (کـوورەی هـەنگ) لـەنێوان (٤٥٠-٥٠٠) کـوورەی هـەنگ لەناوچـەی لێکۆڵینـەوەدا هەیـە کـە هەریەك لە گوندەکانی (تەنـدوورە- هێلـەوە) بـەناوبانگن لەبـەخێوکردنی هـەنگ و بایەخدان بەکوورەی هەنگ، بەجۆرێك بەرهەمی هەر شانەیەکی هەنگ لەناوچەکەدا لەنێوان (٤-٦) کیلۆ دەبێت، بەرهەمەکەش بۆ ساغکردنەوەی ڕاستەوخۆ ڕەوانـەی ناوچەکانی بەکاربردن واتە بازاڕ دەکرێت[٢٨].

لەکۆتایی ئەم تەوەرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە چالاکی کشتوکاڵ بەیەکێك لـەدیارترین و گـرنگترین پیشـەکانی گوندنشـینانی ناحیـەی شـەمامك دادەنـدرێت، چونکە ڕاستەوخۆ متمانەی ڕۆژانەی دانیشتوانەکە لەسەر ئەم پیشەیە بەندە ئەمـە سەرەڕای بەخێوکردنی ئاژەڵ، هەڵبەت بایەخـدانی دانیشـتوان بـەم چـالاکییە ئـەو ئەنجامە دەداتە دەست کەناوچەیەکی کشـتوکاڵییە و هـەر ئـەو چـالاکییەش ڕۆڵـی کارای لەپرۆسەی وەبەرهێنانی ئابووریی ناوچەکەدا هەیە، کە ئەمەش کۆڵەکەیەکی بەهێزە بۆ پرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی لەناحیەکەدا.

**سێیەم: چالاکی پیشەسازی:**

ناوچـەی لێکۆڵینــەوە جیادەکرێتــەوە بــە بــوونی ژمارەیــەکی بەرچــاو لــە پیشەسـازی قـوڕس، هـەروەها پیشەسـازی سـووك، بـەتێڕامان لە(خشـتەی -١١) دەردەکەوێت بەجۆرێك ژمارەی کارگەی پیشەسازییەکان لەسەرئاسـتی ناوچـەکەدا گەیشتۆتە (٢٠٦) کارگەی پیشەسازی کـە بەسـەر هەریـەك لـە کارگـەکانی (بلـۆك، ئاســنگەری، ئەلــەمنیۆم، کاشــی، هــاڕینی ئــارد، کارگــەی دارتاشــی و کارگــەی پلاستیك، کارگەی چاکردنەوەی ئۆتۆمبێل) دابەش بوون، هـەروەك لـە خشـتەکەدا تێبینی دەکرێت.

لەسەر ئاستی هەریەك لەم کارگە پیشەسازییانەش ژمارەی کارگەی (بلۆك) گەیشتۆتە (٢٤) کارگە. بەڵام ژمارەی کارگەی (ئاسنگەری) بریتی بووە لە (٢٠) کارگە، سەرەڕای ئەمەش (٢٠) کارگەی (دارتاشی)و (١٠) کارگەی (پلاستیکی) تێدایە، جێی ئاماژەیە کە (٩٥٪)ی دانیشتوانی ناحیەکە دەستی کاری هەریەك لەم کارگە پیشەسازییانە پێکدێنن، کەمتر پشت بەدەستی کار بەستراوە، جگە لە بوونی هەریەك لەم کارگە پیشەسازییانە، لەناوچەی لێکۆڵینەوە هەروەها گەورەترین وێستگەی کارەبا لەخۆدەگرێت، سەرەڕای بوونی کۆمپانیایەکی گەورەی سووتەمەنی کە تایبەتە بەبەرهەمهێنانی نەوت ئەویش (کۆمپانیای نەوتی خورمەڵە)یە کە دەکەوێتە گوندی (هێلەوە)، شایانی ئاماژەیە کە بەشێك لەو کرێکارانەی لەم کۆمپانیایە کاردەکەن لەبنەڕەتدا دانیشتوانی هەمان ئەو گوندەنو ژمارەیەکیشیان دانیشتوانی گوندەکانی دیکەی ناوچەی لێکۆڵینەوەن[٢٩]. بوونی چالاکی پیشەسازی لە ناوچەکەدا لە دوو روانگەوە گرنگە:

١– بۆتە فاکتەرێکی بەهێز بۆ دەستەبەرکردنی هەلی کار لە ناوچەکەدا وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا زۆربەی کرێکارانی کارگەی پیشەسازییەکان لەدانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوەن، ئەمەش بۆتە فاکتەرێکی گرنگی زیادبوونی داهاتی ئەو کرێکارانە و خۆی لەخۆیدا یارمەتیدەرێکی گرنگە بۆ پەرەپێدانی ئابووری و دواتر پەرەپێدانی لادێیی تێیدا.

٢– دامەزراندنی وێستگەی کارەبا و بوونی کۆمپانیای دەرهێنانی نەوتی خورمەڵە لە ناحیەکەدا فاکتەرێکی دیکەیە بۆ دەستەبەر کردنی هەلی کار بۆ کرێکارانی ناحیەکە.

**خشتەی – ١١–**

**کارگەکانی پیشەسازی لە ناحیەی شەمامك ساڵی ٢٠١٤**

| ژ | جۆری کارگە | ژمارەی کارگە |
|---|---|---|
| ١ | کارگەی بلۆك | ٢٤ |
| ٢ | ئاسنگەری | ٢٠ |
| ٣ | ئەلەمنیۆم | ١٦ |
| ٤ | کۆنکریتی ئامادەکراو | ٢ |
| ٥ | کارگەی کاشی | ٦ |

| | | |
|---|---|---|
| ٦ | كارگەی هارینی ئارد | ٢ |
| ٧ | كارگەی دارتاشی | ٢٣ |
| ٨ | كارگەی پلاستیكی | ١٠ |
| ٩ | كارگەی چاكردنەوەی ئۆتۆمبێل | ٢٠ |
| ١٠ | وایرمەنی كارەبا | ١٦ |
| ١١ | شوێنی چاكردنەوەی ئامێری كشتوكاڵی | ١٠ |
| ١٢ | شوێنی كەلوپەلی یەدەگ (ئۆتۆمبێل) | ١٨ |
| ١٣ | شوێنی كۆگا | ١٠ |
| ١٤ | شوێنی شوشتنگەی ئۆتۆمبێل | ٥ |
| ١٥ | گۆرەپانی شوشتنی قوم و چەگل | ٥ |
| ١٦ | شوێنی سیكرابی ئۆتۆمبێل | ٥ |
| ١٧ | شوێنی جۆراوجۆر (چاكردنەوە– تەعدیلچی– روونگۆر) | ١٤ |
| | كۆی گشتی | ٢٠٦ |

**سەرچاوە: كاری توێژەر پشتبەستن بە: قایمقامیەتی قەزای ناوەندی هەولێر، بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی شەمامك، بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی شەمامك، بەشی پلاندانان و بەدواداچوون، ئاماری كارگە پیشەسازییەكانی ناحیەی شەمامك، (٢٠١٤) (داتای بڵاونەكراوە).**

لە كۆتایی ئەم تەوەرەدا دەگەینە ئەو راستییەی كە بوونی چالاكییە پیشەسازییەكان بەجیاوازی جۆریانەوە فاكتەرێكی گرنگن لە پرۆسەی پێشخستنی كەرتی ئابووری لە ناوچەكەدا لەلایەك و هەروەها یارمەتیدەرێكی گرنگیشە بۆ پرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی لەناوچەی لێكۆڵینەوە.

**چوارەم: رێگای گواستنەوە:**

**هەڵبەت** رێگای گواستنەوە وەك یەكێك لە بنەما مرۆییەكان بوونی گرنگە لەپرۆسەی بەرەو پێشچوونو بووژانەوەی لادێیی، ناوچەی لێكۆڵینەوە بەتۆڕێك لە رێگای قیرتاوكراو بەستراوەتەوە، بەو واتایەی كە لە(٩٠٪) گوندەكانی ناحیەكە خاوەن رێگای قیرتاوكراون[٣٠]. لە سەیركردنی (نەخشەی–٤) دەردەكەوێت ژمارەیەك رێگای گواستنەوە گوندەكانی سنووری ناوچەی لێكۆڵینەوە دەبەستێتەوە هەریەكەیان بەدرێژایی جیاواز، گومان لەوەدا نییە كە بوونی

رێگاكانی گواستنەوە لە ناحیەكەدا یارمەتیدەرێكی باش بووە بۆ ئاسانی راییكردنی كارو چالاكی رۆژانەی دانیشتوان هەروەك لەپێشتر رۆشنایی خراوەتەسەر ناوچەكە بەناوچەیەكی كشتوكاڵی دەناسرێتەوە بۆیە رۆژانە دانیشتوانی ناحیەكە بەتایبەتی چینی جووتیار بەرهەمەكانیان چ (سەوزە)، یان شیرەمەنی (ماست و پەنیر و گۆشت) دەهێنن بۆ بازاڕ بەمەبەستی بەكاربردنیان و ساغكردنەوەیان سەرەڕای ئەوە ناوچەكە جیا لەوەی ناوچەیەكی كشتوكاڵییە هەروەها جیادەبێتەوە بەبوونی كۆمەڵێكی جیاواز لە كارگە پیشەسازییەكان بێگومان گواستنەوەی بەرهەمی هەریەكێك لەم كارگە پیشەسازییانە پێویستی بەبوونی تۆڕێكی رێگای گواستنەوە هەیە بۆ ئەوەی رۆژانە كەرەستە پیشەسازییەكان لەناوچەكانی بەرهەمهێنان (كارگە) بگوازێتەوە بۆ ناوچەكانی بەكاربردن، لەم رووەوە بوونی رێگاكانی گواستنەوە لە دوو لایەنەوە سوودمەند دەبێت بۆ گوندنشینانی ناحیەكە لەوانە:

١- یارمەتی خێرایی گەیاندنی بەرهەمەكان بەتایبەتی بەرهەمە كشتوكاڵییەكان دەدات بۆ بازاڕ و دوورخستنەوەیان لەمەترسی پیسبوون.

٢- ئاسانی گەیشتن بۆ شوێنی كار ئەوانەی لەدەرەوەی سنووری كارگێڕی ناحیەكە كاردەكەن، بوونی رێگاكانی گواستنەوەش لە ناحیەكەدا یارمەتیدەرە بۆ ئاسانی هاموشۆكردنی هاووڵاتیان لەنێوان بەشە جیاجیاكانی ناوچەكە لەپێناو راییكردنی كاروچالاكییەكانیان لەنێوان بەشە جیاجیاكانی ناحیەكە و دەرەوەی سنووری ناحیەكە، سەرەڕای خێرایی لە گەیاندنی بەرهەمە كشتوكاڵییەكانو پیشەسازییەكان بۆ ناوچەی بەكاربردن (بازاڕ).

**پێنجەم: تەندروستی:**

لە تێبینیكردنی (خشتەی -١٢) ناو و ژمارەی بنكە تەندروستییەكان دەردەخات لەناوچەی لێكۆڵینەوە، بەجۆرێك لەسەر ئاستی ناحیە ژمارەی بنكە تەندروستییەكان گەیشتۆتە (١٥) بنكەی تەندروستی، بەڵام پێویستە ئەم راستییەش بخەینە سەر كە بنكە تەندروستییەكان بەشێوەیەكی یەكسان و هاوسەنگ لەتەواوی گوندەكانی ناحیەكە فەراهەم نەبوون و بەجۆرێك (١) بنكەی تەندروستی بەرامبەرە بە (٤) گوند، لەبەر ئەوە زۆربەی كات كە دانیشتوان

لەهەنـدێ گونـدی ناحیەكـە پێویسـتییان بەبنكـە تەندروسـتییەكان دەبێـت لـەم رووەوە سەردانی نزیكترین بنكە دەكەن لـە گوندەكـەیان، ئـەم حاڵەتـە لەهەریـەك لەگوندەكانی (ئەصحابە، گردمحەمەد) دەردەكەوێت، بێگومـان بـوونی كـەموكوڕی لـەم خزمەتگوزارییـە لـەم رووەوە گرفتـی بـۆ گوندنشـینانی ناوچـەكە دروسـت كردووە[٣١]. سەبارەت بە ژمارەی پزیشك لەسەر ئاسـتی ناحیـە وەك لەخشـتەكەدا سەرنج دەدرێت بریتی بوو.

لەسـەر ئاسـتی ناحیـە زۆرتـرین ژمـارەی بنكـە تەندروسـتییەكان كەوتۆتـە هەریەك لە گوندەكانی (پیرداود) و (قۆریتان) و (تەرجان) واتـە سـەنتەری ناحیـە. كە ئەمەش بۆبەرزی چڕی دانیشـتوانی گونـدەكانی ئامـاژە بـۆ كـراو دەگەڕێتـەوە چونكە یەك بەدوای یەك ژمارەی دانیشتوانانی گەیشـتۆتە (٤٠١٥) (٣٥٣٠) (٣٢٤٢) كەس[٣٢]

بریتی بووە لە (٣٥) پزیشك، بەڵام ژمارەی كارمەنـدانی تەندروسـتی (٤٤) كارمەند بووە، سەبارەت بـەژمارەی ئۆتـۆمبێلی فریـاگوزاری لەسـەر ئاسـتی بنكـە تەندروستییەكان گەیشتۆتە (١٧) ئۆتۆمبێل.

بێگومان فەراهـەمبوونی بنكـە تەندروسـتییەكان بـەگوێرەی پێویسـت نییـە لەسەر ئاستی تەواوی گونـدەكانی ناوچـەكە وەك پێشـتر ڕۆشـنایی بـۆ كـرا، بۆیـە پێویستە ئەم كەموكوریەی كـە گونـدەكانی ناحیەكـە هەیانـە لـەم خزمەتگوزارییـە نەهێڵدرێت، كە ئەمەش لەم رووەوە فاكتەرێكی یارمەتیدەر دەبێت بۆ باشتركردنی پرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی لەناحیەكەدا.

**خشتەی -١١-**

**بنكە تەندروستییەكانی ناحیەی شەمامك**

| ناوی بنكە | ژمارەی بنكە | ژمارەی پزیشك | ژمارەی كارمەندی تەندروستی | ژمارەی ئۆتۆمبێلی فریاگوزاری |
|---|---|---|---|---|
| سەنتەری ناحیە | ٢ | ٤ | ٧ | ١ |
| عارەب كەند | ١ | ٤ | ٤ | ١ |
| شێخان | ١ | ٣ | ٢ | ١ |
| قەتەوی | ١ | ٣ | ٤ | ٢ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| تووڕەق | ١ | ٢ | ٤ | ٢ |
| تەرجان | ٢ | ٤ | ٣ | ٢ |
| قۆریتان | ٢ | ٤ | ٤ | ١ |
| مامزاوە | ١ | ٢ | ٤ | ١ |
| گردعازەبان | ١ | ٢ | ٣ | ٢ |
| عەلیاوە | ١ | ٢ | ٣ | ١ |
| هێلەوە | ١ | ٢ | ٢ | ١ |
| میرزا احمد | ١ | ٣ | ٤ | ٢ |
| کۆی گشتی | ١٥ | ٣٥ | ٤٤ | ١٧ |

**سەرچاوە: ئامادەکراوە لەلایەن توێژەر پشتبەستن بە: حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی تەندروستی ، بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی هەولێر، ئاماری بنکە تەندروستییەکانی سنووری ناحیەی شەمامك (چاپکراوە و بڵاونەکراوەتەوە).**

## ئاسۆی ئایندەی پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەی شەمامك

هەڵبەت قسەکردن دەربارەی ئاسۆی پەرەپێدانی ئایندەی لادێیی ناحیەی شەمامك پێویستییەکی گرنگە لەکاتی ئێستا یان لەداهاتوو، هەروەك لەباسەکانی لێکۆڵینەوە رۆشنایی خرایە سەر ناوچەکە خاوەن کۆمەڵێك توانستە لە(سروشتی و مرۆیی) بۆیە لە رێگەی بەکارهێنانی هەریەك لەم توانستانە دەتواندرێت ئاسۆیەکی گەش بۆ ئاراستەی پەرەپێدانی لادێیی لەناوچەکەدا بکێشرێت بەجۆرێك لەسەر ئاستی توانستە سروشتییەکان (بەرزی و نزمی) هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا کە ناوچەکە لەدەشتێکی تەخت دەچێت ئەوەش ئەو راستییە دەخاتە روو کە ناحیەی شەمامك تۆپۆگرافیایەکی ئالۆزی نییە دەتواندرێت سوودی لێ وەربگیرێت بۆ پیادەکردنی چاندنی باشترین جۆری بەروبووم (گەنم و جۆ) و کەساڵانەش لە رووی بڕشت و جۆرەوە داهاتێکی باش بۆ جووتیارانی دەڤەرەکە بەدی دەهێنێت، کە بێگومان ئەمەش بۆ لەباریی جۆری خاکەکە دەگەڕێتەوە، دەرامەتی ئاو توانستێکی دیکەیە وەك لە توێژینەوەکە دەرکەوت کە دانیشتوانی ناحیەی شەمامك. بۆ پشت بەستنی رۆژانەیان لە پێداویستی ئاوی خواردنەوە و ئاوی ئاودێری و ئاودانی ئاژەڵەکانیان زیاتر بریتییە لە (بیر) بەهەردوو جۆریەوە (بیری ئاسایی)و (بیری قووڵ)، بەڵام هەندێك لەگوندەکان ژمارەی بیرەکانیان لە

(١) بیر زیاتر نییە، بۆیە لەبەر ئەوەی (بیر) وەك یەكێك لە گرنگترین شێوەکانی ئاوی ژێر زەوی هەڵدەستێ بە پڕکردنەوەی پێویستی ڕۆژانەی دانیشتوان پێویستە بایەخ بدرێت بەلێدانی بیری ئیرتوازی دیکە بۆ ئەوەی هەموو گوندەکانی ناوچەکە وەك یەك بن لە فەراهەمکردنی ئەو پێویستییە گرنگە، کە ئەوەش بەهەمامەنگی نێوان هاوڵاتیان و لایەنی پەیوەندیدار دەبێ، بۆ ئەوە لەم ڕووەوە ئەو کەموکوریەی کە گوندنشینانی ناحیەکە لەبارەی دەرامەتی ئاوەوە هەیانە لایەنی کەم چارەسەر بکرێت و ئاراستەیەکی گرنگیش لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی ناوچەکە بەدی بهێندرێت.

لەسەر ئاستی توانسته مرۆییەکانیش وەك دەزانرێت کە دانیشتوان و بایەخدان بەدانیشتوان لەپرۆسەی پەرەپێداندا لەو بنەمایەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت کە مرۆڤ ئامرازو ئامانجی پەرەپێدانە واتە مرۆڤ چەقی پرۆژەکەیە، بۆیە لەپێناو گەیشتن بەدیاریکردنی گرفتەکانی دانیشتوان لە ناحیەکە پێویستە لەناخی خەڵکەکە بکۆڵدرێتەوە بەمانای ئەوەی کە پەیوەندییەکی تەواوکار و بەردەوام هەبێتو ڕێز لە بۆچوونی خەڵکی ناوچەکە بگیرێت. هەرلەسەر ئاستی توانسته مرۆییەکان، کشتوکاڵ بەپیشەی سەرەکی گوندنشینانی ناحیەکە دادەنرێت، چونکە ناوچەکە لە ڕووی بەرزی و نزمی بووە یارمەتیدەرێکی گرنگ بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە تیایدا.

بۆیە لەپێناو بەدیهێنانی پەرەپێدانی کشتوکاڵ تێیداو پاشان گەیشتن بەپەرەپێدانی لادێیی پێویستە جووتیارانی ناوچەکە بایەخ بەچاندنی تۆی پەسندکراو بدەن بۆ ئەوەی باشترین (بڕ و جۆر)ی بەرهەم بەدەست بهێنن، تۆڕی ڕێگای گواستنەوە توانستێکی دیکەیە کە لەناوچەکەدا دەردەکەوێت کە وەك ناوەندێکی گرنگ توانیویەتی گوندەکانی ناحیەکە لەلایەك و ناوچەکانی بەرهەمهێنان بە ناوچەکانی بەرکابردن ببەستێتەوە لەڕووی دابینکردنی بنکەی تەندروستی لە ناوچەکەدا وەك لەمیانی توێژینەوەکە تیشکی خرایە سەر کە ئەم خزمەتگوزارییە بەشێوەیەکی هاوسەنگ لەتەواوی گوندەکانی ناحیەکەدا دابەش نەبووە، چونکە (٤) گوند بەرامبەر بە(١) بنکەی تەندروستییە، کە لەم ڕووەوە دانیشتوان گرفتیان بۆ دروست دەبێت، لەبەر ئەوە پێویستە لەم ڕوووەوە کەموکوریەکان لەلایەن لایەنی پەیوەندیدارەوە نەهێڵدرێت بۆ ئەوەی ئاراستەی پەرەپێدانی لادێیی لە تەواوی ناوچەکە بەدی بهێندرێت.

## ئەنجامەكان

**لێكۆڵەر لە لێكۆڵینەوەكەیدا گەیشتە ئەو ئەنجامانەی خوارەوە:**

١- پەرەپێدان بەوە راڤە دەكرێت كە بریتییە لەهەوڵ و كۆششی هاوڵاتیان و حكومەت لەپێناو چاكتركردنی ژیانی ئابووری و كۆمەڵایەتی و بەشداری پێكردنی هاوڵاتیان لە بەرەوپێشبردنی كۆمەڵگە.

٢- پەرەپێدانی لادێیی هەموو ئەو هەوڵ و كۆششانە دەگرێتەوە كە پلانی بۆ دادەرێژێت لەسەر بنەمای كات و شوێنی دیاریكراو لەپێناو ئەوەی كە كەرتی لادێ بكەن بەزۆرترین كەرتی بەرهەمهێنان.

٣- ناوچەی لێكۆڵینەوە لە رووی بەرزی و نزمییەوە لە دەشتێكی تەخت پێك هاتووە، هەربۆیە ئەم دەشتە بۆتە فاكتەرێكی كارا بۆ سوود وەرگرتن لێی و بەمەبەستی ئەنجامدانی چالاكیی ئابووری لە پێشەنگیان كشتوكاڵ كە بەپیشەی سەرەكی دانیشتوانی گوندەكانی ناحیەی شەمامك هەژمار دەكرێت هەربۆیە بەرزی و نزمی رۆڵێكی گرنگی لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی ناحیەكە هەبووە.

٤- خاك وەك یەكێك لە توانستە سروشتییەكان، رۆڵی دیاری لە پرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی ناوچەی لێكۆڵینەوە نواندووە، لەمیانی بەكارهێنانی بۆ چاندنی دیارترین جۆری بەروبوومی كشتوكاڵی كە بریتین لە (گەنم و جۆ)

٥- كشتوكاڵ وەك یەكێك لەتوانستە مرۆیییەكان بەشداربووە لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی، دیارترین بەشداربووە لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی، دیارترین ئەو بەرهەمانەی كە بایەخ بەچاندنیان دەدرێت لە ناوچەكەدا (بەرهەمی دانەوێڵە و پاقڵە و سەوزەوات)ە.

٦- رێگای گواستنەوە رۆڵی گرنگی لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی ناحیەی شەمامك هەیە، لەمیانی ئەوەی كە ناحیەكە بەتۆڕێك لە رێگای گواستنەوە بەناوچەكانی هاوسنووری ناحیەكە بەستراوەتەوە ئەمەش یارمەتی ئامانجی گەیشتنی دانیشتوانی ناحیەكە دەدات بۆ شوێنی كار ئەوانەی لەدەرەوەی سنووری كارگێڕی ناحیەكە كاردەكەن، سەرەڕای ئاسانی گواستنەوەی كەرستەی كشتوكاڵی پیشەسازییەكان لە ناوچەكانی بەرهەمهێنان بۆ ناوچەكانی بەكاربردن.

٧- چالاكی پیشەسازی بەجیاوازی جۆری كارگەكان رۆڵی خۆی نواندووە لەسەر پرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی لە ناحیەكەدا. لەمیانی دەستەبەركردنی هەلی كار بۆ گوندنشینانی ناحیەكە.

## راسپاردە

**لەبەر رۆشنایی دەرئەنجامەكانی خرانە ڕوو ئـەم لێكۆڵینەوەیـە پێشـنیازی جێبەجێكردنی ئەم راسپاردانەی خوارەوە دەكات:**

١- بایەخـدان بەدامەزرانـدنی فەرمانگـەی ئامـاری دانیشـتوان لەسـنووری ناحیەی شەمامك، چونكە لەمیانی لێكۆڵینەوەی گۆڕەپانیدا توێژەر بۆی دەركـەوت كە كەموكورپیەكی زۆر لە ئامارەكـانی پێویسـت بـە دانیشـتوانی ناحیەكـە هەیـە، بۆیـە بـوونی دەزگایـەكی ئامـاری هـەموو ساڵەكانی دانیشـتوانی ناوچـەكەی تێـدا كۆكرابێتـەوە یارمەتیـدەر دەبێـت، بـۆ سەرخسـتنی پرۆسـەكانی پەرەپێـدانی دانیشتوان لەلایەك و هەروەها كارئاسانی بۆ توێژەرانی دانیشتوانیش دەكات لـەم رووەوە.

٢- هەماهەنگی كردن لە ناحیەكە لەپێناو زیـاتر ئاگـاداربوون لەكێشـەكانی هاوڵاتیـان چـونكە تێكـەڵبوون لەگـەڵ هاوڵاتیـان دەبێتـە زیـاتر چارەسـەر كردنـی كێشەكانیان و سەرخستنی پرۆسەی پەرەپێدانی لادێیی لەناحیەكەدا.

٣- حكومـەت بایـەخ بـدات بەكڕینـەوەی بەرهـەمی جووتیـاران بـەنرخێكی گونجاو چونكە لەلایەك دەبێتـە هـۆی بەرزكردنـەوەی ئاسـتی بـژێویی جووتیـاران، لەلایـەكی دی بەرهـەمهێنانی بـەروبوومی خۆمـاڵی زیـاتر دەبێـت، ئەمـەش خـۆی لەخۆیدا هەنگاوێكی گەوهەرییە بۆ بەدیهێنانی ئاسایشی خۆراك.

٤- دابینكردنـی ئـەو ئـامێر و ئامرازانـەی كـە لـە رووی كشـتوكاڵییەوە بەكاردەهێندرێن لەوانە ئامێری (پرژاندن- مرەشە) ئاودێری بەدڵۆپانـدن و پێـدانی بـەجووتیاران بـەنرخێكی گونجـاو و هـەرزان، چـونكە وەك پێشـتر رۆشـناییمان خستەسەر ناحیەكە لـەرووی سەرچـاوەی ئـاوی سـەرزەوی هـەژارە، بۆیـە متمانـە دەخاتە سەر ئاوی ژێر زەوی بۆ راییكردنی كار و چالاكییەكانیان.

٥- هـەروەك لـە لێكۆڵینەوەكـەدا دەركـەوت ناحیـەی شـەمامك لـە رووی فەراهەمبوونی خزمەتگوزاریی تەندروستی بەشێوەی یەكسان لەتەواوی گوندەكانی نییە، بەڵكو كەموكوڕی هەیە لەم بارەیـەوە، بـەجۆرێك (٤) گونـد بەرامبـەر بـە(١) بنكەیە، بۆیە لەسەر لایەنی پەیوەندار پێویستە كە ئەم كەموكوریە نەهێڵێت.

## پەراوێزەكان:

(١) ناحیەی شەمامك: بەگوێرەی بڕیاری كارگێڕیی ژمارە (٧٨٩٩) ڕێكەوتی (٢٠٠٤/١٠/٣٠) بوو بەناحیە و ناوەندەكەی گوندی (پیرداود) بووە سەر بەقەزای خەبات، لەڕێكەوتی (٢٠٠٦/١١/٢٦) پاڵپشت بەفەرمانی كارگێڕی ژمارە(٧١٥٩) ناحیەی شەمامك، بەهەموو گوندو كەرتەكانیەوە بەقەزای ناوەندی هەولێر لكێنرا بۆ زیاتر زانین بڕوانە:

حكومەتی هەرێمی كوردستان، وەزارەتی ناوخۆ، پاێزگاری هەولێر، خۆیەتی، ژمارە (٧٨٩٩) لەڕێكەوتی (٢٠٠٤/١٠/٣٠)، حكومەتی هەرێمی كوردستان، وەزارەتی هەرێم بۆ كاروباری ناوخۆ، پارێزگای هەولێر، خۆیەتی، ژمارە (٧١٥٩) لەڕێكەوتی (٢٠٠٦/١١/٢٩).

(٢) هاشم ياسين حمدامين الحداد، التباين المكاني لتغير الانماط الزراعية في قضاء خبات مقارنة باستخدام الوسائل الاحصائية ونظم (Gis). لسنتي (٢٠٠٠– ٢٠٠٤)، اطروحة دكتورا، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٩، ص٦. (غير المنشورة).

(3) Jerome fellman and ArtherGetis, Human Geography, - Land scapes of Human activities, 5th- Edition, New york, 1999, p 333.

(٤) محمد دلف احمد الدليمي و فواز احمد موسى، جغرافية التنمية– مفاهيم– نظريات– تطبيق، دار الفرقان للطباعة والنشر والتوزيع، ط١، سوريا، ٢٠٠٩، ص٢٥.

(٥) منصور الراوي، تنمية الموارد البشرية (مفهومها– أهميتها)، مجلة النفط والتنمية، سنة ١٣، العدد (٣)، ١٩٨٨، ص٣٤– ٣٥.

(٦) محمد عبدالفتاح محمد، تنمية المجتمعات المحلية من منظور الخدمة الاجتماعية، مكتب الجامعي الحديث، الاسكندرية، ٢٠٠٨، ص٣٧.

(٧) بەهرە ڕضا عثمان، جیاوازی شوێنی پەرەپێدانی كشتوكاڵی لە پارێزگای هەولێر، لێكۆڵینەوەیەكە لە جوگرافیای پەرەپێدان، نامەی ماستەر، كۆلێجی ئەدەبیات، زانكۆی سەلاحەددین– هەولێر، ٢٠١٣، ل٧٧ (بڵاو نەكراوەتەوە).

(٨) صلاح الدين الشامي، بحوث الجغرافية، منشأة المعارف، الاسكندرية، ٢٠٠١، ص١٥١.

(٩) علي لبيب، قاموس الجغرافيا، دار العربية للعلوم، ط١، بيروت، ٢٠٠٤، ص٩٠.

(١٠) بشير ابراهيم لطيف، التنمية الزراعية ومواجهة التحديات، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، العدد ٤٠ـ ١٩٩٩، ص٣.

(١١) ازاد محمدامين النقشبندي، التنمية السياحية واثرها على صيانة البيئة الطبيعية، مجلة البيئة والتنمية، شرم الشيخ، ٢٠٠٤، ص٨١– ٨٢.

(١٢) محمد احمد عقلة المؤمني وآخرون، التنمية في الوطن العربي، دار الكندي للنشر والتوزيع، ط١، الاردن ١٩٩٨، ص١٢٣.

(١٣) ايمن سليمان و علي فالح الشوابكة، البيئة والمجتمع، دار الشروق للنشر والتوزيع، ط١، عمان– الاردن، ٢٠٠٣، ص٢٢١.

(14) John Harries, Rural Development, Conway street, London, wip, 1982, P. 15.

(١٥) مختار حمزة و زملائه، دراسات في التنمية الريفية المتكاملة، سلسلة التنمية الريفية المتكاملة، مطبعة دار التأليف، القاهرة، ١٩٧٦، ص٦٤١.

(١٦) حسن عبدالقادر صالح، التوجيه الجغرافي للتنمية الوطنية والاقليمية، دراسة تطبيقية على وطن العربي، دار وائل، عمان، ٢٠٠٣، ص٢٤٥.

(١٧) صبرى فارس الهيتي وحسن ابو سمور، جغرافية الاستيطان الريفي والتنمية الريفية، دار الصفاء للنشر والتوزيع، ط١، عمان، ٢٠٠٠، ص١٩٦.

(١٨) هۆگر جمیل ئه‌حمه‌د، دابه‌شبوونی جوگرافی دانیشتوانی قه‌زای سۆران و كاریگه‌ری له‌سه‌ر په‌ره‌پێدانی لادێیی، نامه‌ی ماسته‌ر، كۆلێجی ئه‌ده‌بیات، زانكۆی سه‌لاحه‌ددین، هه‌ولێر، ٢٠١١، ل١٠٢، (بلاونه‌كراوه‌ته‌وه‌).

(١٩) خليل اسماعيل محمد، السكان والمسألة السكانية في كوردستان العراق، مطبعة جامعة صلاح الدين– اربيل، ٢٠١٢، ص١٢٢.

(٢٠) محمد السيد الامام، المجتمع، المجتمع الريفي– رؤية حول واقعه ومستقبله، المكتبة المصرية للنشر والتوزيع،ط١، ٢٠٠٧، ص٢٧٢.

(٢١) محمد عبدالفتاح محمد، تنمية المجتمعات المحلية من منظور الخدمة الاجتماعية المكتب الجامعي الحديث الاسكندرية، ٢٠٠٨، س٣٨.

(٢٠) وه‌زاره‌تی كشتوكاڵ و سه‌رچاوه‌كانی ئاو، به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی كشتوكاڵی هه‌ولێر، به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی توێژینه‌وه‌ی كشتوكاڵی، به‌شی خاك، زانیاری ده‌رباره‌ی خاكی ده‌شتی شه‌مامك ، (ئاماری بلاونه‌كراوه‌).

(٢١) وه‌زاره‌تی كشتوكاڵ و ئاودێری، به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی كشتوكاڵی هه‌ولێر، هۆبه‌ی كشتوكاڵی شه‌مامك، ڕاپۆرتێك ده‌رباره‌ی بڕشتی به‌رهه‌مهێنان و داهاتی ساڵانه‌ی جووتیار له‌ ناحیه‌ی شه‌مامك (٢٠١٢)، ئاماری بلاونه‌كراوه‌.

(*) له‌و ته‌وه‌ره‌دا ڕۆشنایی نه‌خراوه‌ته‌ ئاوی سه‌ر زه‌وی، چونكه‌ ئه‌م سه‌رچاوه‌ ئاوییه‌ له‌ ناوچه‌ی لێكۆڵینه‌وه‌ له‌ خانه‌ی نه‌بوون ئه‌ژمار ده‌كرێت.

(٢٢) چاوپێكه‌وتنی توێژه‌ر له‌گه‌ڵ به‌ڕێز (بهاءالدين شمس الدين) لێپرسراوی به‌شی پلاندانان و به‌دواداچوون له‌ به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی ئاوی ژێر زه‌وی، ناحیه‌ی شه‌مامك ، ڕۆژ و به‌روار (٢٠١٥/٢/٢٦).

(٢٣) وەزارەتــی نــاوخۆ، پارێزگــای هــەولێر، قایمقامیــەتی قــەزای ناوەنــدی هــەولێر، بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی شەمامك، بەشی پلاندانانو بـەدوا داچـوون ، ژمـارەی دانیشـتوانی ناحیەی شەمامك ساڵی (٢٠١٤) (ئاماری بڵاونەکراوە).

(٢٤) چـاوپێکەوتنی توێـژەر لەگـەڵ (ئـەمین عەبـدوڵڵا)، بەڕێوەبـەری ناحیـەی شـەمامك ڕۆژ و بەروار ٢٠١٤/١١/٢.

(٢٥) سەرچـاوە: وەزارەتـی نـاوخۆ، پارێزگـای هـەولێر، قایمقامیـەتی قـەزای ناوەنـدی هـەولێر بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی شـەمامك، ئامـاری ئاوارەکـانی سـنووری ناحیـەی شـەمامك سـاڵی (٢٠١٤) (داتای بڵاونەکراوە).

(٢٦) وەزارەتی ناوخۆ، پارێزگای هەولێر، بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی شـەمامك، بەشـی پلانـدانان و بەدواداچوون، ئاماری ئاوارەکانی سنووری ناحیەی شەمامك، ٢٠١٤ (داتای بڵاونەکراوە)

(٢٧) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ بەڕێز (عبدالواحد احمد) لێپرسراو لە بەشی سـامانی ئـاژەڵی و ڤێتێرنەری لە هۆبەی کشتوکاڵی شەمامك، ڕۆژ و بەروار (٢٠١٥/٢/٢٥).

(٢٨) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ هەنگەوان (محەمەد ئەمین) دانیشتووی گونـدی هێلـەوە، ڕۆژ و بەروار (٢٠١٥/٢/٢٥).

(٢٩) وەزارەتی ناوخۆ، پارێزگای هـەولێر، قـەزای ناوەنـدی هـەولێر، بەڕێوەبەرەیـەتی ناحیـەی شەمامك، بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی شەمامك، ڕاپۆرتێك دەربارەی کارگە پیشەسـازییەکان و سنووری کارکردنیان لە ناوچەی شەمامك، لە ساڵی (٢٠١٤). داتای بڵاونەکراوە.

(٣٠) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ بـەڕێز (ئـەمین عەبـدوڵڵا)، بەڕێوەبـەری ناحیـەی شـەمامك، ڕۆژ و بەروار ٢٠١٢/٢/٢٥.

(٣١) چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ بـەڕێز (ئەرسـەلان عومـەر)، بەڕێوەبـەری کـارگێڕی ناحیـەی شەمامك، ڕۆژ و بەروار (٢٠١٥/٢/٢٦).

(٣٢) وەزارەتـی نـاوخۆ، پارێزگـای هـەولێر، بەڕێوەبەرایـەتی ئامـاری هـەولێر، بەشـی ئامـاری دانیشتوان و هێزی کار، ئاماری دانیشتوانی سنووری ناحیەی شەمامك،(داتای بڵاونەکراوە)

## ملخص البحث

## الامكانات الجغرافية للتنمية الريفية في ناحية شمامك

تشكل دراسة الامكانات الجغرافية للتنمية الريفية احد اهم الموضوعات المهمة في جغرافية الاستيطان الريفي، التي تهتم باظهار دور واهمية الامكانات الطبيعية والبشرية للتنمية الريفية، وايضا القاء الضوء على مفهوم التنمية والتنمية الريفية بشكل خاص، الذي يركز على رفع المستوى المعاشي للسكان في النواحي الاقتصادية والاجتماعية والبيئية لتصبح المناطق الريفية الوسط المناسب لحياة سكانها. وتكمن اهمية الدراسة في ان القطاع الريفي يعد اهم المقومات لتعزيز وتقوية الاقتصاد في المنطقة، علاوة على ذلك يعتبر العامل المساعد لنهوض وتطور الحركة الاقتصادية بين الحضر والريف.

تتكون الدراسة من ثلاثة فصول اساسية، تناول الفصل الاول محورين: المحور الاول: خصص لـ (تعريف منطقة الدراسة)، والمحور الثاني لمفهوم التنمية والتنمية الريفية في منطقة الدراسة. اما الامكانات البشرية فكانت من نصيب الفصل الثالث. وتوصلت الدراسة الى ان منطقة الدراسة تمتاز ( بالامكانات الطبيعية والبشرية) التي تساعد على تطور وتنمية القطاع الريفي فيها، وخاصة الامكانات الطبيعية، وفي مقدمتها التضاريس، لانها منطقه سهلية منبسطة فضلا عن ذلك تعتبر الزراعة المهنة الرئيسية لسكان ريف المنطقة. اما بخصوص الامكانات البشرية فتعتبر (طرق المواصلات) التي تربط بين الناحية والقرى المجاورة اهم الامكانات البشرية التي ساعدت على تسهيل حركة السكان وتوصيل منتوجاتهم الزراعية الى مناطق الاستهلاك.

**وفي ضوء الاستنتاجات السابقة توصي الدراسة بمايلي:**

١- اهتمام حكومة الاقليم بشراء منتوجات الفلاحين بقيمة مناسبة.

٢- الاهتمام بتأسيس مراكز مختصة بعدد السكان وبياناتهم الديموغرافية.

# Abstract

**Geographical Potentialies of Rural Development in Shamamek Subdistrict**

The study of the geographical potentialities for the rural development considers as one of the most important issues in the Rural Settlement Geography studies, which demonstrates the role and importance of physical and human potentialities of rural development, and also sheds light on the concepts of development and rural development, especially rural development concept, which focuses on raising the living standards of the rural population in the economic, social, and environmental aspects and the environmental aspects. This is in order to make it in appropriate ambiance for the life of rural population. The importance of this study is that the rural sector consider as the most important sector to enhance and strengthen the economy of the region, as well as it regards a catalyst factor for the raising and development of the economic movement between urban and rural areas. The study consists of three main chapters. The first chapter included two main axes : the first axis is devoted for (the definition of the study area) and the second axis is about the concept of development and rural development. The second chapter is devoted for the study of the physical potentialities of rural development in the study area. Concerning the human potentialities, this part of the study is dedicated in the third chapter. The study concluded that the study area is characterised by physical and human potentiality that helps the evolution and development of the rural sector, particularly the physical potentialities starting with relief potentiality because of study area's plain nature as well as the agriculture considers as the main occupation of the rural population in the study area. Concerning the human potentiality, the (transportation) that links the centre of the subdistrict and neighboring villages regards as the most important human potentiality that helps to facilitate the movement of people and deliver their products to consumption centres. In the light of previous conclusions we can suggest the following recommendations : - KRG government should interest and concern in buying farmer's products in appropriate prices. And also should establish research centers of population and their number in the study area.

# گەشەپێدانی گەشتوگوزاری ئاوی سەر زەوی لە هەرێمی چیایی پارێزگای هەولێر

**(زێی گەورە بە نموونە)**

**م.ی. هودا سەباح نەجمەددین**
بەشی کارگێڕی – دەزگاکانی گەشتیاری
– پەیمانگای تەکنیکی هەولێر

**١- پێشەکی**

سامانی ئاوی.. لەبەر ئەوەی زۆربەی توێژینەوەکان جەخت لەسەرگرنگی ڕووە ئاوییەکان دەکەنەوە،بۆیە بەیەکێک لە بنەما گەشتوگوزارییە گرنگەکان دادەندرێت، چونکە کاریگەری تەواوی لەسەر بەدەستهێنانی ناوچەی گەشتوگوزاری هەیە، هەروەها بنچینەی گەشەپێدان و خستنەگەڕی گەشتوگوزاران لەهەر هەرێم و وڵاتێکدا، ئەو بنەمایە هێزی ڕاکێشانی گەشتوگوزاری تێدایەو دەبێتە هۆکارێک بۆ سەردانیکردنی هەر ناوچەیەک لەلایەن گەشتیارانەوە.

**١-٢ : ئامانجی توێژینەوەکە بریتییە لە:**

بەرچاو ڕوونکردن و دەرخستنی ڕۆڵی دەرامەتی ئاوی سەر زەوی و توانای سوود لێوەرگرتنیان لەپرۆسەی گەشەپێدان لە زێی گەورەدا.

**١-٣: گرنگی توێژینەوەکە:**

١- گرنگی توێژینەوەکە لەوەدایە..گەشەپێدانی گەشتوگوزاری بەپێداویستییەکی گرنگ دادەندرێت، لەبەر ئەوەی ئابووری وڵات و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان لە میانەی نەهێشتنی بێکاری و زیادکردنی

بوارەکانی کارکردن لەگەڵگەشەسەندنی باری کۆمەلایەتی و رۆشنبیری، ئەمانەگشتیان بەگەشەپێدان وپەرەپێدانی گەشتوگوزارەوە بەندن.

٢- دیاریکردنی خاسیەتەگەشتوگوزارییەکان یارمەتی دارشتنی پلانی گەشەپێدانی سەرکەوتوو دەکات بۆپەرەپێدانی توانستە گەشتوگوزارییەکان بەگشتی و توانستی سامانی ئاوی لە هەرێمی چیایی بەتایبەتی.

گرفتی لێکۆڵینەوەکە خۆی لەوە دەدۆزێتەوە : دەوڵەمەندی هەرێمی چیایی پارێزگای هەولێر بە سامانی ئاوی و زیادبوونی داواکاری گەشتوگوزاری لە کوردستان و عێراقدا، بەلام تاکو ئێستا ئەم ناوچەیە وەک پێویست گەشەپێدانی ئاویی بەخۆیەوە نەبینیوە.

**١-٤ : بەمەبەستی گەیشتن بەئامانجە دەستنیشانکراوەکان،لێکۆڵینەوەکە دابەش کراوەتە سەرچەند تەوەرێک:**

یەکەم : دیاریکردنی ناوچەی لێکۆڵینەوە لەپاڵ پێناسەکردنی چەمکی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری ودیاریکردنی ئامانجەکانی.

دووەم: ئەمەیش تایبەتە بەدیاریکردنی توانستی جوگرافی گەشتوگوزاری ئاوی سەر زەوی لەهەرێمی چیایی پارێزگای هەولێر.

سێیەم : گەشەپێدانی گەشتوگوزاری لە زێی گەورەدا.

چوارەم : دەرئەنجام وپێشنیاز.

**٢- یەکەم : دیاریکردنی ناوچەی لێکۆڵینەوە:**

**٢-١ : شوێنی جوگرافی ناوچەی لێکۆڵینەوە:**

گرنگی (شوێن) لەوەدا دەردەکەوێت کە دەبێتە هۆی دیاریکردنی چوارچێوەیەکی جوگرافی بۆ ناوچەکەو ئەو خەسڵەتە سروشتییانەی هەیەتی، لەلایەکی ترەوە ماوەی ئەو دوورییەی کەلە نێوان دەرچوونی گەشتیارەکەو شوێنی پێشوازیکردنیدا ئەوماوەیەی پێویستە بۆ برینی ئەو دوورییە دیاری دەکات[1] کاریگەری شوێنی جوگرافی لەسەر گەشتوگوزارەوە لە دوولاوە بەدیار دەکەوێت:

**یەکەمیان** / شوێنی ناوچەی ڕاکێشانی گەشتیار لە ناوچەکانی دەرچوونی گەشتیاران و ئارەزوومەندانی خۆشگوزەرانی، هەر چەندە شوێنەکە لە سەرچاوەکانی هاتنی گەشتیارەوە نزیک بێت و بتوانرێت بەخێرایی و بە ئامرازی گواستنەوەی جۆراوجۆر و بە تێچوونێکی کەمەوە بیگاتێ ئەوا زیاتر پەسەندترە.

**دووەمیان** / شوێنی فەلەکی کاریگەری بەسەر ژینگەی سروشتی وئاووهەواو بەگەڕخستنی گەشتوگوزاردا هەیە، هەروەها شوێنی جوگرافی بە هۆکارێکی گرنگ دادەندرێت لە دیاریکردنی سیمای هەندێک لە توخمەکانی ئاووهەوا لە هەر هەرێمێکدا.[٢]

باشترین شوێنی جوگرافی بۆگەشتوگوزاری نێو دەوڵەتی ئەوەیە کە: ئەو هەرێمە بکەوێتە نێوان ئەو هەرێم و شوێنە گەشتوگوزارییە پێشکەوتووانەوە کە خاوەن جموجووڵێکی گەشتوگوزاریی گەورەبن لە نێوان خۆیاندا ئەوەی تایبەتە بە شوێنی ناوچەی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ناوچەکانی دەوروبەری، ئەم هەرێمە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی پارێزگای هەولێر پێکدێنێت.

ناوچەی لێکۆڵینەوە لە رووی شوێنی فەلەکییەوەدەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی (¯٥١، ٣٥°- ¯٣٧،١٨°) باکوور و هەردوو هێڵی درێژی (¯٤٣،٤٩°- ¯٤٥،٠٥°)ی رۆژهەڵات نەخشەی (١). لەبەشی باکوردا، ناوچەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ وڵاتی تورکیا هاوسنوورە کە درێژی سنوورەکەی (١٢٧کم)، هەروەها ئێران کەوتۆتە ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵاتی کە درێژی سنوورەکەی (١١٦کم) لەهەمانکاتدا ناوچەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەردوو پارێزگای دیکەی هەرێمی کوردستان دراوسێی یەکن، ئەوانیش پارێزگای (سلێمانی، دهۆک)ن، پارێزگای سلێمانی دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی لێکۆڵینەوە، بە درێژی (١٥٤)کم، هەرچی پارێزگای دهۆکیشە دەکەوێتە ڕۆژئاوای باکووری ڕۆژئاوای هەرێمی لێکۆڵینەوەکە و درێژییەکەی (١٣٢کم)ە لە باشوورەوە ئەم هەرێمە لە ڕێگەی سنوورێکی سروشتییەوە هاوسنوورە لەگەڵ هەرێمی دەشتایی پارێزگای هەولێردا، کە درێژی سنوورەکەی دەگاتە (١٦٠کم) [٣].

نەخشەی ژمارە (٢)

پێگەی ناوچەی لێكۆڵینەوە لە عیراق و پارێزگای هەولێردا




سەرچاوە : حكومەتی هەرێمی كوردستان، وەزارەت پلاندانان، بەڕێوەبەرایەتی گشتی نەخشەدانان، نەخشەی تۆپۆگرافی پارێزگای هەولێر، بەپێوەری ١ : ١٠٠٠٠٠ ساڵی ٢٠٠٩.

پێگەی جوگرافی ناوچەی لێكۆڵینەوە وای لێ كردووە ببێتە نێوەندێک بۆ بەستنەوەی هەرێمەكە بەپارێزگاكانی تری هەرێمی كوردستانی عیراق، جگە لەمەش بۆتە ئەڵقەی بەیەكگەیشتنی نێوان وڵاتانی (ئێران – توركیا) ئەویش لە

میانەی تێپەڕبوونی چەندان تۆڕی گواستنەوەی گرنگپێیدا، ڕێگای یەکەمیان: یەکێکە لە ڕێگە سەرەکییەکانی عیراق کە لە ناوەراستي شاری هەولێرەوە دەست پێدەکات کە بەرێگای (هاملتۆن) ناسراوە تا دەگاتە حاجی ئۆمەران لەسەر سنووری نێودەوڵەتی عیراق – ئێران، جگە لەو ڕێگایە دوو ڕێگای تریش هەیە کە نافەرمین و ڕێگای خۆڵین.

هەرچی لەگەڵ تورکیایە، ناوچەی لێکۆڵینەوە لە دوو ڕێگەی خاکییەوە لەگەڵ وڵاتی تورکیا پەیوەندی هەیە،یەکەمیان: لە باکووری گوندی (خەزنە)و بە ئاراستەی ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، دووەمیان لەگوندی دێرێ کە کەوتۆتە ئەوپەڕی باکووری رۆژئاوا. بە ئاراستەی رۆژهەلات درێژ دەبێتەوە[٤].

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین ناوچەی لێکۆڵینەوە شوێنێکی جوگرافی باش و سەرنجڕاکێشی لەسەرئاستی هەرێم و عیراقدا هەیە، بۆ ئەنجامدانی گەشتوگوزاری ناوەخۆیی.. ئەمە لەلایەک،لەلایەکی ترەوە شوێنێکی باشی سەبارەت بە وڵاتانی دەوروبەری ناوچەکە هەیە، بە تایبەتی ئێران و تورکیا کە سنووری هاوبەشیان لە نێوانیاندا هەیە ئەمەش دەبێتە هۆکارێک بۆ دروستبوونی گەشتوگوزاری هەرێمی، جگە لەوەی دەڤەری لێکۆڵینەوە شوێنێکی مامناوەندی سەبارەت بە وڵاتانی ترهەیە، بە تایبەتی خۆرهەلاتی ناوەڕاست و ئەوروپا کە دەبێتە هۆکارێک بۆ دروستبوونی گەشتوگوزاری نێودەوڵەتی.

**٢-٢: ڕووبەرو دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە:**

رووبەری ناوچەی لێکۆڵینەوە بەگشت قەزاکانییەوە دەگاتە (٧٢٦٧,٧کم٢)[٥]. بە سەرنجدان لە خشتەی تایبەت بە رووبەری قەزاکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت کە: بریتین لە قەزاکانی (مێرگەسوور،چۆمان، سۆران، رەواندز) سەرجەمی رووبەرەکەیان کەوتۆتە نێو ئەم هەرێمە، بەلام بەشی هەرە گەورەی رووبەری قەزای شەقلاوە و بەشێکی بچووکی رووبەری قەزای کۆیە کەوتۆتە نێو ئەم هەرێمەوە.

ناوچەی لێکۆڵینەوە، رووبەرێکی باشی هەیەو دەتواندرێت سوودی لێوەربگیرێت بۆ دامەزراندنی چەندین پرۆژەی گەشتوگوزاری و دامودەزگای

گەشتیاری، بێگومان دامودەزگا گەشتیارییەکان هۆکارێکن بۆ بەرەوپێشچوونی گەشتوگوزارو ڕاکێشانی گەشتیاران، جاچ لە ناو سنووری هەرێم یان لە دەرەوەی هەرێم بێت.

هەرچی ئەوەی تایبەتە بە دانیشتوانەوەوەک دەزانین دروستبوون و پێشکەوتنی گەشتوگوزار لە هەر ناوچەیەک پەیوەندنی بەلایەنی دیموگرافی دانیشتوانەوەیە، چونکە سەرکەوتنی گەشتوگوزار لە بنەڕەتدا پشت بە دانیشتوان دەبەستێ چونکە دانیشتوان خۆیان سەرچاوەیەکن بۆ دروستبوونی گەشتوگوزاری ناوەخۆیی، ئەمە لەلایەک لەلایەکی ترەوە کاریگەری ئەرێنی و ڕاستەوخۆی لەسەر زیادکردنی دەستی کار دەبێت ئەمەیش یەکێکە لەپێداویستەکانی چالاکی گەشتوگوزاری.

سەبارەت بەژمارەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوەکە، وەک لە خشتەی ژمارە (٢)دا دەردەکەوێت لە ساڵی (٢٠٠٩) دا بەنزیککراوەیی گەیشتۆتە (٣٢٢٠٠٦) کەس هەژمارکراوە، هەرچی ئەوەی تایبەتە بەپێکهاتەی ژینگەیی، ژمارەی شارنشینانی ناوچەکە (٢٣١٥٧٢) کەسن، کە (٦٥,٧ %) ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە پێک دەهێنن.

خشتەی ژمارە (٢)

رووبەرودابەشبوونی ژینگەی دانیشتوانی یەکە کارگێڕییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بۆ ساڵی (٢٠٠٩)

| یەکەی کارگێڕی | رووبەر کم٢ | ژمارەی دانیشتوان | شارنشین | گوندنشین | (%)ی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر |
|---|---|---|---|---|---|
| مێرگەسور | ١٨١٩ | ٤٤٦٨٦ | ١٥٢٧٠ | ٢٩٤١٦ | ٢,٦ |
| سۆران | ٢٠١٨ | ١٥٤٩٤٥ | ١٢٢٣٣٩ | ٣٢٦٠٦ | ٩,٢ |
| چۆمان | ٩٠٨,٣ | ٢٦١٣١ | ١٤٥١٠ | ١١٦٢١ | ١,٥ |
| رەواندز | ٨٣٤ | ٢١٢٨٠ | ١٢٧٦١ | ٥٨١٩ | ١,٢ |
| شەقڵاوە | ١٠٩٣,٤ | ٨٧٢٣٩ | ١٦٥٦٨ | ٢٥٦٧١ | ٥,٢ |
| کۆیە | ٥٩٥ | ١٧٧٢٥ | ٥١٢٤ | ١٦٦٠١ | ١ |
| کۆی گشتی | ٧٢٦٧,٧ | ٣٢٢٠٠٦ | ٢٣١٥٧٢ | ١٢٠٤٣٤ | ٢٠,٧ |

سەرچاوە / حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان، دەستەی ئاماری هەرێم، بەڕێوەبەرایەتی ئاماری پارێزگای هەولێر، هۆبەی ئاماری دانیشتوان وهێزی کار،ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر بەپێی پرۆسەی گەمارۆسازی ژمارە ڕێژکردنی ساڵی ٢٠٠٩، ئاماری بڵاونەکراوە.

**٣- دووەم : چەمکی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری دیاریکردنی ئامانجەکانی**

گەشەپێدان لەبنەڕەتدا بریتییە لەپرۆسەی گۆڕینی ژێرخانی ئابووری و کۆمەلآیەتی بۆ هەموو ئاراستەو چالآکی و دیاردەو ئاکارە کۆمەلآیەتی و ئابوورییەکان، ئەم گۆڕانە درێژ دەبێتەوە بۆ هەموو لایەنێک لەلایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵگە وپێکهاتە (ستراکتۆر) دەگرێتەوە(٦).

گەشەپێدانی گەشتوگوزاری یەکێکە لە نوێترین جۆرەکانی گەشەپێدان، لەهەمانکاتدا تێکەلآوییەکی زۆر لەگەڵ گشت گەشەپێدانەکانی تر هەیە، واتە هاوشێوەیە لەگەڵ گەشەپێدانی گشتی،چونکەگشت بنەماکانی گەشەپێدانی گشتی بریتییە لە بنەماکانی گەشەپێدانی گەشتیاری، بۆیە بابەتی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری لەلایەن زۆر لە وڵاتان یەکێکە لە بابەتە سەردەمییەکان، لەبەر ئەوەی ئامانجی بەشداریکردنە لە زیادکردنی داهاتی ڕاستەقینەی تاکە کەس، دواتر بەیەکێک لە لقە سەرەکییەکانی داهاتی نەتەوەیی دادەندرێت(٧).

دەتوانین پێناسەی گەشەپێدانی گەشتوگوزار بکەین بەوەی کە بریتییە لە کردارێکی تێکەلآو کە چەندین توخم لە خۆ دەگرێتەوە و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر هەیە، هەوڵی بەدیهێنانی کردارێکی پراکتیکییە بەمەبەستی گەیشتن بۆ بەکارهێنانی نموونەیی بۆ توخمەکانی بەرهەمهێنانی گەشتوگوزاری سەرەتایی لەچوارچێوەیەکی سروشتی وشارستانی ئەمەشیان لە میانەی پێشکەوتنی زانست وتەکنەلۆجیا ئەنجام دەدرێت وبەستنەوەیان بە توخمەکانی ژینگەو بەکارهێنانی وزەی تازەبووە کە نەخشە بۆ بەرنامەکانی گەشەپێدان دەکێشێ(٨).

لەروانگەی ئەم پێناسەیەوە دەکرێ چەمکی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری بخەینە ڕوو:

١- گەشەپێدانی گەشتوگوزاری ئەو پرۆسەیە کە گرنگی بەپێشکەوتنی باری ئابووری کەرتی گەشتوگوزاری دەدات.

٢- گەشەپێدانی گەشتوگوزاری ئەو پرۆسەیە پەیرەوی هاوچەرخترین تەکنیک و تەکنەلوژیا دەکات بە مەبەستی سوود وەرگرتن لەم دەرامەتە گەشتوگوزارییانەی بەدی دەکرێن.

٣- گەشەپێدانی گەشتوگوزاری هەوڵدەدات گۆڕانێکی ڕیشـەیی لەهـەموو توخمـەکانی گەشـتوگوزار بێنەکایـەوە لـەپێناو بـەکارهێنانی نموونـەیی بـۆ توخمەکانی گەشتوگوزار.

٤- مرۆڤ توخمێکە لەپرۆسەی گەشەپێدان لەبەرئەوەی ئەو هەڵدەستێ بە دانانی بەرنامە و نەخشەی گونجاو.

**٣-٣: ئامانجەکانی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری**

گەشەپێدانی گەشتوگوزاری کۆمەڵێک ئامانجی دیاریکراوی هەیە:

١- ئامـانجی گەشـەپێدانی گەشـتوگوزاری : گەشەسـەندنی دەرامـەتی گەشتوگوزارییەکانە بە شێوەیەکی بەردەوام و هاوسەنگ لە میانەی گۆڕانێکی ڕیشەیی لەژێرخانی ئابووریدا و بەرهەمهێنان لە کەرتی گەشتوگوزاردا[٩].

٢- گەشـەپێدانی گەشـتوگوزاری کۆمـەڵێک ئامـانجی گشـتی هەیـە لەوانە گەشەپێدانی گەشتوگوزار لە دەوڵەت هۆکارێکە بۆ بەدیهێنانی گەشـەی گەشتوگوزار بـە شـێوەیەکی هاوسـەنگ بـە جۆرێک کارناکاتـە سـەر ئـابووری نەتـەوەیی بـەڵکو دەبێتـە هۆکارێک بـۆ بەرزبوونـەوەی کۆی داهـاتی دەوڵـەت، بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی تاک لە کۆمەڵگا.

٣- هەوڵدان بۆ زیادکردنی جوولـەی گەشـتوگوزار، زیادکردنی تێکڕای مـاوەی مانـەوەی گەشـتیاران، زیـادکردنی تێکـڕای خـەرجکردنی ڕۆژانـەی گەشتیاران [١٠].

٤- سێیەم : دیاریکردنی توانستی گەشـتوگوزاری دەرامـەتی ئـاوی سـەر زەوی لە هەرێمی چیای پارێزگای هەولێر، مەبەست لـە سـامانی ئـاوی.. ئـاوی بـاران، بـەفر وتـەزرە، ئـاوی سـەر زەوی، ئـاوی ژێـر زەوی، بـاران وبـەفر و تەزرە سەرچاوەی ئاوی سەر زەوی وژێر زەوین، ئاوی سـەر زەوی جۆگـەو چەم و زێ و رووبارو دەریاچـەکان ودەریـاو زەریاکانـە، هـەرچی ئـاوی ژێـر زەوییـە کانیاوەکـان بـە هـەموو جۆرەکانییـەوە دەگرێتەوە،پشـت بەچەنـدین فاکتەر وەکو بڕ و جۆرو توانای بەکارهێنان و تایبەتمەندی شوێنیان و پلـەی گـەرمی ئاوەکـە و سروشـتی کـەنارەکانی وپلـەی سـوێری ئاوەکە دەبەسـتێت.

ئـــاوی ســـەر زەوی وژێـــر زەوی خـــاوەن تایبەتمەنـــدی گـــەورەن لـــە پلاندانانـــە گەشـــتوگوزارییەکاندا، چونکـــە زۆربـــەی چالاکییـــە گەشتوگوزارییەکان پەیوەستن پێیەوە[11]، جا چ بەشێوەکی راستەوخۆ بێت وەک چالاکییـەکانی (خلیسکان لەسـەر ئـاو، سـەوڵ لێدان، مەلـەکردن، راوە ماسی...) ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر کاریگەری ناڕاستەوخۆی سامانی ئاو پەیوەستە بە جوانکردنی سروشت و بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی وپیشەسازی ودابینکردنـی پێداویستی بنکـە گەشـتوگوزارییەکان وپێداویسـتی رۆژانـەی گەشـــــتیاران [12]. ئـــــەوەی شـــــایەنی باســـــە لێکۆڵینـــــەوەکان دەریانخستووە پێداویستی گەشتیاران لە کەمپە گەشتوگوزارییەکان (١٠٠-١٥٠) لتر بۆ هەر گەشتیارێک لە رۆژێکدا، بەڵام لە هۆتێلەگەشتوگوزارییەکان (٢٥٠-٣٥٠) لتر[13].

هەرچی سەبارەت بە ناوچەی لێکۆڵینەوەیە دەوڵەمەندە بە سەرچاوەی ئاوییـەکانی سـەرزەوی کـە بۆتـە کەرەسـەی خـاو بـۆ چەنـدین چـالاکی گەشـتوگوزاری، لێـرەدا هەوڵـدەدەین بـە وردی بـاس بکـەین لـە ناوچـەی لێکۆڵینەوە :

**٤-١: ئاوی سەرزەوی**

ئـاوی سـەرزەوی بـە هـەموو شـێوەکانی، گرنگییـەکی زۆری لـە رووی گەشتوگوزارییەوە هەیە بەتایبەتی لە وڵاتە کیشوەرییەکان بۆیە دەبینین ئەو شـوێنانەی ئـەو دەرامەتـە ئاوییانـەی تێدایـە چەنـدین شـارو مەڵبـە نـدی گەشتوگوزاری تێدا دروست کراوە وەک شاری گەشتوگوزاری لە دەوری دەریاچەی حەبانییە و دوکان و موسل و لە عیراق، بالاتۆن لە هەنگاریا[14].

ناوچـەی لێکۆڵینـەوە لـەڕووی سامانی ئـاوی سـەر زەوی دەوڵەمەنـدە، ئـەوانیش ئـاوی رووبـارو چـەم ورێژگـەکان دەگرێتـەوە، بەشـێکی زۆری ئـەم چـەم و رێژگانـە دەکەونـە حـەوزی زێیگـەورە لـە وانە(شـەمدینان، رێـزان، رەواندوز، هـەریر) لـە کاتێکدا رێژگـەکانی (هیـران وروبـاری کۆیـە) دەکەونـە حەوزی زێی بچووکەوە نەخشەی ژمارە (٢).



ئەم سەرچاوە ئاوانەی لە نێو سنووری ناوچەی لێکۆڵینەوە هەڵدەقوڵێن یان بە سنووری ناوچەکە گوزەر دەکەن، ئەوانیش بریتین لە:

١- زێی گەورە / یەکێکە لە لقە سەرەکییەکانی رووباری دیجلە کە لە زنجیرە چیا بەرزو سەختەکانی باکووری کوردستان و ناوچەی هەکاری هەڵدەقوولێت بەناوچەی لێکوڵینەوە تێدەپەڕێت لە خاڵی تێکەڵبوونی بەرێژگەی شەمدینان دێنە ناو خاکی ناوچەی لێکولینەوە[١٥]، بەهۆی تێپەربوونی ئەم زێیە بە ناوچەیەکی سەختی بەرزونزم هەرێمی چیایی پارێزگای هەولێردا، چەندین دیاردەی جوان و سەرنجڕاکێش و سەرسوڕهێنی دروستکردووە لەپاڵ دەوڵەمەندبوونی کەناری ئەو زێیە بە پۆشاکی رووەک، ئاژەڵ و باڵندەی کێوی لە بابەتی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری بە تێرو تەسەلی لێی دەدوێین. درێژی ئەم زێیە لە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەگاتە (٢٧کم)[١٦]وێنەی (١).


وێنەی (١) زێی گەورە



٢- چەمی شەمدینان /یەکێکە لەڕێژگەکانی زێی گەورە هەروەها بە (رووباری شین) ناوەزەد دەکرێت. ئەم چەمە لە سێ خۆراکدەری سەرەکی پێکهاتووە، بەشێکیان لە ناو سنووری عیراق سەرچاوە دەگرن لەچیای سەرمەیدان، بەشەکەی تر لەوڵاتی تورکیا هەڵدەقووڵێت[١٧]. ئەم سنوورە بەشێک لە سنووری ناوچەی لێکۆڵینەوە پێک دێنێت بە ناوچەیەکی چیایی سەخت تێدەپەڕێت، بەمەش ئاوەکە بە خێرایەکی زۆر گوزەر دەکات لە ناوچەکە دەبێتە هۆکارێک بۆ دروستبوونی چەندین خەرەندی قووڵ ودیاردەی سروشتیی دانسقە وەک تاڤگەو دیاردەی کارستی خەرەندو چەندین دیاردەی تر.

ئەوەی شایانی باسە ئەم چەمە لە رووی خزمەتگوزاریی گەشتوگوزارییەوە بێبەشە، لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە دوورە دەستە ئەمە لەلایەک لەلایەکی ترەوە بە هۆی تێپەڕبوونی بە سروشتێکی تۆبۆگرافیای سەخت ئەمەش وا دەکات گەیشتن بە ئاوی ئەم چەمە ئەستەم بێت، جگە لەمەش ناوچەکە چۆڵ کراوە بەهۆی بارودۆخی سیاسیی نێوان تورکیا وپەکەکە وێنەی (٢).

وێنەی (٢) چەمی شەمدینان



٣- چەمی ڕێزان (ڕووکوچک)/ ئەم چەمە لەیەکگرتنی دوو سەرچاوەی سەرەکی پێکدێت کە ئەوانیش بریتین لە ئاوی چەمی حاجی بەگ و چەمی بەرازگر لە نزیک گوندی خێرەزۆک لەسەر سنووری نێوان عیراق وتورکیا بەیەک دەگەن، ئاوی دۆڵی خواکورک دەڕژێتە ئەم چەمە، لەم ڕێژگە سەرەکییانەچەند سەرچاوەیەکی بچووکیش دەگەن بەچەمەکە لەوانە هیپە وهۆرێ چەمی ڕێزان (ڕووکوچک)پێک دەهێنن[١٨]. ئەم چەمەش بەیەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی زێی گەورە دادەنرێت درێژییەکەی لە سەرچاوەکەی تا ئاوڕێژگەکەی دەگاتە (٨٥کم) لەلای گوندی ڕێزان دەڕژێتە زێی گەورە، بۆیە هەندێ جار بەچەمی ڕێزان ناودەبرێت[١٩].

ئەوەی شایەنی ئاماژەیە ئەم چەمە بە ناوچەیەکی سەختی بەرزی و نزمی تێدەپەڕێت کە بەچەندین گەلی تەنگەتۆر نێوان زنجیرەچیاکان گوزەر دەکات، بۆیە خێرایی لەبەر ڕۆیشتنی ئاوەکە زۆرە بەتایبەتی لەلای شێروان مەزن وڕێزان، هەروەها دەتواندرێت لەو بەشە سوود لە خێرایی ئاوەکە وەربگیرێت بۆ بەدەستهێنانی وزەی کارەبا.

وێنەی (٣)



**سەیرانگای زورگڤان**



**سەیرانگای رێزان**

بەهۆی هەڵکەوتنی ئەم چەمە لە ناوچەی بارانی مسۆگەر دەکرێت سوود لە ئاوەکە وەربگیرێت لەچەندین بواری جۆراوجۆر هەرچەندە تا ئێستا سوود لە ئاوی چەمی رێزان وەرنەگیراوە بەشێوەیەکی زانستییانە بۆلایەنی گەشتوگوزاری لەگەڵ ئەوەی ئەم چەمە چەندین سەیرانگە ودیمەنی جوان و سەرنجراکێشی هەیە، وەکو سەیرانگەی زراری ورێزان وزورگڤان وێنەی(٣).

بۆیە دەتواندرێت بە درێژایی ئەم چەمە کۆمەڵێک خزمەتگوزاری گەشتوگوزاری دابین بکرێت وەک:-

أ- بەکارهێنانی هەندێ شوێنی تایبەت بۆ راوە ماسی سنووردار بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە خێرایی ئاوەکەیان لەسەرخۆیە و ماسی تێدا بەدی دەکرێت بە تایبەتی لەلای سەیرانگەی زراری و سەیرانگەی رێزان.

ب- هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی یارییەکانی سەوڵ لێدان وگەڕان بەناو ئاودا بە بەلەمی بچووک و ماتۆرسکیلی تایبەت، لەپاڵ بەکارهێنانی بەشی هەرە زۆری ئەم چەمە بۆ مەلەکردن لەو جێگایانەی کە لێژییان کەمترە لەلێژبوونەوەی گشتیی زێی گەورە لە سنووری ناوچەکەدا بەتایبەتی لە وەرزی هاویندا.

ت- دابینکردنی شوێنی حەوانەوە و خواردنگا لە نزیک ئەم چەمە لەبەرئەوەی ئەم ناوچەیە بەشێوەیەکی گشتی لەو خزمەتگوزارییانە بێبەشە.

پ- جۆری ئاوەکەو سیفاتە کیمیاییەکانی بۆ هەموو کارێکی ڕۆژانە ودابینکردنی پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی گەشتیار گونجاوە، بەڵام بۆ هەندێ چالاکی پێویستی بە خاوێنکردنەوە هەیە.

٤- چەمی ڕەواندز/ سەرچاوەکانی ئەم چەمە لەنێوان ناوچەی لێکۆڵینەوەو سنووری نێو وڵاتی ئێران هەڵدەقووڵێت لە بەرزاییەکانی قەندیل و زنجیرە چیاکانی حەسارۆست. ئەم چەمە یەکێکە لە ڕێژگە گرنگەکانی زێی گەورە لە سێ سەرچاوەی لاوەکی پێکهاتووە کە بریتین لە (جندیان، باڵەکایەتی، خەلیفان (ئالانە) هەریەک لەو سەرچاوانەش لەچەند سەرچاوەی تر پێکهاتووە، درێژی چەمی ڕەواندز لە سەرچاوەوە تا ئاو ڕێژگەکەی دەگاتە (٨٦کم)[٢٠].

ئەوەی جێگای ئاماژەیە ئەم چەمە چەندین دیاردەی جوان و سەرنجڕاکێشی هەیە، وەک بوونی خەرەندی ڕەواندز وێنە (٤) لەپاڵ دەوڵەمەندی بەدارودرەختی هەمەچەشن بەدرێژایی ڕێرەوە ئاوەکە.


وێنەی (٤) چەمی ڕەواندز



ڕووباری ڕواندز
2010/03/22

٥- چـەمی مـاوەران / لـەچیای سـەفین سـەرچاوە دەگرێـت بـە دۆڵـی دەربەنـدی شـەقڵاوەدا تێپـەڕ دەبێت، لەگونـدی میـراوە جۆگەڵەیـەکی بـەناوی جۆگەڵەی (میراوە) دەرژێتە سـەری و بـەرەو دۆڵی مـاوەران لـەوێ بەچـەمی مـاوەران دەناسـرێت، ئاراسـتەکەی بـەرەو بـاکورە تـا دەگاتـە زێـی گـەورە، درێژییەکەی (٤٨کم) دەبێت[٢١].

ئەم چەمـەش چەنـدان جۆر پۆشـاکی رووەکی تێدا بـەدی دەکرێت وەک داری ئەسپندار وبی وهەنار وچەندین جۆری تریش،جگە لەمـەش رۆخـی ئـەم چەمە گونجاوە بۆگەشـتوگوزار بـەهۆی کـەمی لێژی رۆخـی چەمەکە. وێنـەی (٥). هـەرچی سـەبارەت بـە رێژگـەکانی حـەوزی زێـی بچـووک بـریتین لـە رووباری کۆیە چەمی هیـران، نازەنین دەکەونە بەشـی باشـووری رۆژئـاوای ناوچەی لێکۆڵینەوە دەرژێتە زێی بچووکەوە.


وێنەی (٥) چەمی ماوەران



لــەپاڵ بــوونی ئــەو چەمانــەی لــە ناوچــەی لێکۆڵینــەوە چەنــدین بێرمیش(گۆماوی سەر چیاکان تێدا بەدی دەکرێت کە لە شـێوەی دەریاچـەی بچـووک بـە دیاردەکـەون ئـەو بێرمانـەش قـەبارەیان جیـاوازە هەنـدێکیان وەرزین و هەندێکی تریان هەمیشـەیین بە درێژایی سـاڵ ئاویـان تێدایە، ئـەم بێرمانە زیاتر لە زنجیرەچیاکان بە دیاردەکەون بەتایبـەتی لـە زنجیرە چیـای

حەسارۆست لەچیاکانی رۆستێ و زەرو شەلان چەندین چیای تریش،گرنگترین بێرمەکان بریتین لە[٢٢]:

أ- بێرمی چلدارە / ئەم گۆماوە بە دووری ١٩١کم لە باکووری شاری هەولێرهەڵکەوتووە لە دەڤەری باڵەکایەتی رووبەرێکی فراوانی هەیە و بەناو قەدی شاخی هەڵگوردەوە هەڵکەوتووەو خودان گۆماوێکی ساردو سازگارە و هەمیشە بە درێژایی ساڵ ئاوی تێدایە وشک نابێت بەبێ ئەوەی لە هیچ لایەکەوە ئاوی تری بێتەسەری وێنەی(٦) .

وێنەی (٦) بێرمی چلدارە



ب- بێرمی سەر نشێوە/ئەمەش یەکێکە لە بێرمە هەمیشەییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە بەردەمی بێرمەکەدا جۆگەیەکی لێدەبێتەوە ئاوی لەبەر دەڕوات کەوتۆتە قەدپاڵی رۆژهەڵاتی لووتکەی هەڵگورد بە دیوی گوندی گردەژۆر.

پ- بێرمی کویتە / ئەم بێرمەش کەوتۆتە قەد چیای هەڵگورد و پانی ئەم بێرمە دەگاتە (٤٢م) ناوچەیەکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێشە لە ناوچە گەشتوگوزارییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە، لە وەرزی گەشتوگوزاری خەڵکی ناوچەکە رووی تێدەکەن بەمەبەستی سەیران. ئەو ناوچەیە چەندین جۆری گژوگیاو گوڵی تێدا بەدی دەکرێت وەکو گوڵە نێرگزو دەمەشێرو گوڵەڕوون و چەندین جۆری تر.

ت- بێرمی دینداران / ئەمەش یەکێکە لە بێرمە فراوانەکان کە درێژییەکەی دەگاتە (٨٠٠م) و پانییەکەی لە دەوری (٦٠٠م) دایە، شێوەیەکی هێلکەیی هەیە، دەوروبەری ئەم بێرمە تەختاییە کە دەتواندرێت سوودی لێوەربگیرێت. ئەم بێرمە دەکەوێتە سەرچیای بێرکمە لە باکوری رۆژهەلاتی ناحیەی سیدەکان ئەوەی شایانی باسە ئەو بێرمە ئاوەکەی لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمەوە تا کۆتایی مانگی ئازار دەیبەستێ و شێوەی دەریاچەیەکی بەفرین وەردەگرێ بە گوێرەی گۆتەی خەڵکی ناوچەکە دەڵێن لە ناوەڕاستی زستاندا ولاغیان بەبارەوە بەسەردا تێپەڕاندووە کەچی شەختەکە نەشکاوە[٢٣].

ج- بێرمی بگێل / ئەمەش کەوتۆتە سەرچیای پرخێلند، یەکێکە لە بێرمە هەمیشەییەکان.

ح- بێرمی هۆرنێ / ئەم بێرمە لەسەر چیای موور هەڵکەوتووە گۆمێکی قووڵە و سەرچاوەیەکە بۆ ئاوی چەمی سیدەکان بە درێژایی ساڵ ئاوی لەبەر دەڕوات.

لەپاڵ ئەم بێرمە هەمیشەییانە چەندین بێرمی تریشمان هەیە هەمیشەیین لەوانە (باسکە،پیواز، بێرمە سار، بێکودیان چەندینی تریشمان هەیە وێنە (٧) هەروەها بێرمی وەرزیشمان هەیە لە وانە (سوێلا، بەردە قووچ، گردە سۆر).

وێنەی(٧) بێرمی بێکودیان



### ٥- چوارەم : گەشەپێدانی گەشتوگوزاری لە زێی گەورە

لەم باسەدا دەستنیشانی زێی گەورە دەکەین لە (هەرێمی چیای پارێزگای هەولێر)بە نموونەی شوێنێکی گونجاو و لەبار بۆگەشەپێدانی گەشتوگوزاری لەبەرئەوەی ئەم شوێنە بەشێوەیەکی گشتی خاوەنی چەندین بنەمای جوگرافیای گەشتوگوزاری سروشتی ومرۆییە کە بەگوێرەی پێویست سوودیان لێوەرنەگیراوە و بە شێوەیەکی ئابوورییانە بەکارنەهاتووە.

لێرەدا رۆڵی پلاندانەرە جوگرافییەکان لەگەشەپێدانی گەشتوگوزار دەردەکەوێت، لە میانەی رووپێوکردنی سەرجەم بنەماکان و دیاریکردنی رۆڵی هەریەکەیان لە بەدیهێنانی ئامانجی گەشەپێدانە کە لێرەدا هەوڵدەدەین بە تێروتەسەلی باسی ناوچەی زێی گەورە بکەین بۆ ئەوەی پرۆژەی گەشتیاری تیادا ئەنجام بدرێت.

#### ٥-١: شوێنی جوگرافی زێی گەورە

ئەم زێیە دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای ناوچەی لێکۆڵینەوە، ئەم زێیە لەچەندین چەم وجۆگەلە پێکدێت هەروەک لەباسی سەرچاوەکانی ئاوی سەرزەوی لەپێشەوە باسمانکرد. شوێنی جوگرافی زێی گەورە لەرووی گەشتوگوزاریشەوە پڕ بایەخە، لەبەرئەوەی دەکەوێتە سەر رێگای سەرەکی (هەولێر-دهۆک)و (هەولێر – مێرگەسور)[٢٤] نەخشەی(١،٢).

ئەوەی شایانی باسە بەدرێژایی زێی گەورە چەندین دیمەنی سەرنجراکێشی تێدایە لە بەرزی و نزمی و ئەشکەوت ودۆڵ وگەرووی تەسک ودەربەند و دارودرەخت. کە هەموویان بەیەکەوە وێنەیەکی تەواوکەری گەشتیاری لای گەشتیاران دروست دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی زێی گەورە ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بە بنەمای سروشتی ومرۆیی، کە کۆمەڵێک فاکتەری گەشتیاری لە خۆ دەگرێت کەوا دەکات ئەم ناوچەیە ببێتە ناوچەیەکی گونجاو بۆگەشتوگوزار لەوانە:

١- زێی گەورە لەرووی شوێنی جوگرافییەوە ناوچەیەکی گرنگ و پڕ بایەخە، چونکە ناوچەی لێکۆڵینەوە بەپارێزگای دهۆک دەبەستێتەوە بە هۆی رێگای (شەقڵاوە- هەریر –پردی قەندیل –ئاکرێ-دهۆک)درێژی ئەم رێگایە

دەگاتە (٤٨کم)هەروەها لە ڕێگای (مێرگەسۆر-گەلی ئەشکەفتێ -بلێ-چیای پێرس-ئاکرێ-دهۆک)درێژی ئەم ڕێگایەش دەگاتە (٣٥کم) [٢٥].بەمەش هەرێمی چیایی پارێزگای هەولێر بەپارێزگای دهۆک دەگەیەنێت ئەم ڕێگایانە بریتین لە ڕێگا گەشتوگوزارییەکان کە دەمانگەیەنێت بەبەناوبانگترین ناوچە گەشتوگوزارییەکانی ناوچەکە لەوانە مەزاری نەمران وسەیرانگەی ڕێزان وهاوینەهەواری ڕێزان وهاوینەهەواری زۆرگڤان لەپارێزگای هەولێر، هەروەها هاوینەهەواری هەردوو سیپەی بجیل و ئاکرێ، ئاشاوە و ئەنیشکی، سۆلاف وسەرسەنگ لەپارێزگای دهۆک کە ئەمەش بە فاکتەرێکی باش بۆ ڕاکێشانی گەشتیاربۆ ناوچەکە دادەندرێت.

٢- ناوچەی هەڵبژێردراو، نزیکە لەژمارەیەک مەڵبەندی نیشتەجێبوونی دانیشتوان لەوانە هەروەک لەخشتەی (٣) دیارە کۆی گشتی ژمارەی شارنشینانی ئەو قەزایانەی کەوتوونەتە دەوروبەری ئەم ناوچەیە (٣٣١٩٥٦) هەزار کەسە، ئەمەش خاڵێکی ترە بۆ ڕاکێشانی گەشتیاران بۆ ناوچەکە بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکان.

خشتەی (٣)

ژمارەی شارنشینانی قەزاکانی دەوروبەری کەناری زێی گەورە لەساڵی ٢٠٠٩

| ناوی قەزا | مێرگەسۆر | سۆران | شەقڵاوە | ئاکرێ | ڕەواندز | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی دانیشتوان | ١٥٢٧٠ | ١٢٢٣٣٩ | ٨٦١٧١ | ٩٥٤١٥ | ١٢٧٦١ | ٣٣١٩٥٦ |

سەرچاوە/ ئامادەکراوەپشت بەستن بە :حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان، دەستەی ئاماری هەرێم، بەڕێوەبەرایەتی ئاماری پارێزگای هەولێر، هۆبەی ئاماری دانیشتوان و هێزی کار،ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر بەپێی پرۆسەی گەمارۆسازی ژمارە ڕێژکردنی ساڵی ٢٠٠٩ .

٣- دەوڵەمەندیی زێی گەورە بەسامانی ڕووەک و دارودرەخت بۆتە مایەی پێدانی سیمایەکی جوان بەدرێژایی کەنارەکانی زێ بەتایبەتی دار چنارو گوێزو سپێندارو توو، بی لەپاڵ هەبوونی گژوگیای درێژ وەک قامیش جگە لە دابینکردنی کەشوهەوایەکی فێنک، کەوا لەگەشتیاران دەکات ڕوو لە

ناوچەکە بکەن، هەروەها بۆتە ناوەندێکی سروشتی و زیندووی چەندین ئاژەڵ و باڵندەی کێوی و دەرامەتەکان وێنەی (١١) لە رووپێوێکی مەیدانی بۆ ئاژەڵو باڵندە کێوییەکانی ئەم ناوچەیە بەگشتی، دەڤەرەکانی باکووری هەرێمی چیایی بەتایبەتی لە هەردوو کەژی هاوین وزستاندا ئەنجامدەدرێت، دەردەکەوێ زیاتر لە (٣١) جۆر لە ئاژەڵ و باڵندەی کێوی لە وەرزی زستان و (٤١) جۆر لەوەرزی هاوین لە ناوچەکەدابینراون. ئەو باڵندانەی لەو ناوچانە بینراون (کەو،پۆڕ، سوێسکە، هەڵۆی مسری، قەتێ، ماسیگرە، قومری، سنونوو، رەنگاڵە) لەپاڵ چەندین جۆری تریش لە ئاژەڵەکانیش بریتین لە (مامز، پشیلەی کێوی، گورگ، کەڵە کێوی، کەمتیار و چەندین جۆری تریش) ئەمەش لایەنێکی گرنگی دەوڵەمەندی ناوچەکە نیشاندەدات لە رووی جۆراوجۆری بیۆلۆژییەوە،دەتواندرێت بۆ دروستکردنی گەشتوگوزاری ژینگەیی سوود لەم ناوچەیە وەربگیرێت[٢٦] وێنەی (١٠).

وێنەی (١٠) پۆشاکی رووەکی لە کەناری زێی گەورە



وێنەی (١١) ئاژەڵ و باڵندەی کێوی





**ماسیگره** **ئاسک**

٤- زێیگەورە بە هۆی گوزەرکردنی بە ناوچەیەکی چیایی سەخت و پێچ وئاڵۆزەوە، دەوڵەمەندە بە دیاردەی جیمۆرفۆلۆجییە ناوازەکانی دەربەندو چیا سەرکەشەکان و دۆڵی قووڵ و دەشت وەک (خەرەندی رەواندز، ئەشکەوتی شانەدەر، ئەشکەوتی بێستون، تاقگەی گەلی عەلی بەگ، بێخاڵ، بێرمەکان) وێنەی (١٢)، لە هەندێ شوێنی زێیەکە دوورگەو دیمەنی جوان بەدیاردەکەون بە تایبەتی لە نزیک گوندی بلێ و شانەدەر لە قەزای مێرگەسوور هەروەها لەلای هەریریش لەلای گوندی مەکردان و بەردینی خواروو قورەبەگ کەبەدی دەکرێت، دەتواندرێت سوود لە جیاوازی پێکهاتەی رووی زەوی ناوچەکە وەربگیرێت  بە جۆرێک چەند رواڵەتەکانی رووی زەوی جیاواز بن توانایان بۆ راکێشانی گەشتیاران و تێرکردنی ئارەزووەکانیان زیاترە.

٥- ئاووهەوای ناوچەکە، خاوەنی چەندین رەگەزی ئاووهەوایە، کەوای لێکردووە بە بارودۆخی ئاووهەوای خواستراو بێت بۆپیادەکردنی چالاکییە گەشتوگوزارییەکان. بەتایبەتی لە کەژی گەشتیاری کە ئاووهەوایەکی فێنک و مامناوەندی هەیە.گەشتیار تێدا هەست بە حەوانەوەی جەستەیی و دەروونی دەکات. وەک لە ئامارەکانی وێستگەکان بە دیاردەکەوێت.

وێنەی (١٢) دیاردە جیمورفۆلۆجی یە ناوازەکان



**خەرەندی رەواندز**



**ئەشکەوتی شانەدەر**

أ- هەروەک لە خشتەی (٤) دیارە تێکڕای ئەو بڕە تیشکەی کە دەگاتە ناوچەی لێکۆڵینەوە لە هەریەک لە وێستگەی شەقڵاوە (٦.٩، ١٠.٩، ٧.٥، ٤.٢) کاتژمێرە بۆ وەرزەکانی بەهار و هاوین وپایز و زستان، لەکاتێکدا لە وێستگەی سۆران (٧.٤، ١١.٦، ٧.٢، ٤) کاتژمێری بەردەکەوێت بۆهەمان ریزبەندی وەرزەکان.

خشتەی (٤)

تێکڕای مانگانەی کاتژمێرە خۆراوییە راستەقینەکان

لە وێستگەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە

| وێستگەکان | مانگەکان | | | | | | | | | | | | تێکڕا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ک.دووەم | شوبات | ئازار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمموز | ئاب | ئەیلول | ت.یەکەم | ت.دووەم | ک.یەکەم | |
| و.شەقڵاوە | ٣.٨ | ٣.٩ | ٥.٩ | ٦ | ٩ | ١١ | ١٠.٩ | ١٠,٧ | ٩.٨ | ٧ | ٥,٨ | ٥ | ٧,٤ |
| و.سۆران | ٣.٤ | ٤ | ٥.٥ | ٧,٤ | ٩.٧ | ١٢,٣ | ١١.٩ | ١١,٢ | ٩.٤ | ٧,١ | ٥,١ | ٤.٧ | ٧,٦ |

سەرچاوەکاری توێژەر بەپشتبەستن بە وێستگەی کەشناسی سۆران، شەقڵاوە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٢)

١- حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکاني ئاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵ، هەولێر، هۆبەی ئاماری کەشناسی، ئاماری کاتژمێرە خۆراوییەکان راستەقینەکان تۆماری بڵاونەکراوە.

ئەمەش فاکتەرێکی ئەرێنییە بۆگەشەپێدانی گەشتوگوزاری لە ناوچەی لێکۆڵینەوە. ناوچەی لێکۆڵینەوە تەنیا کەنارەکانی تونس وباشووری ئیسپانیای لێ دەربچێت لەچەندان ناوچەی تری گەشتوگوزاری جیهان وەک کەناری مەراکیش و ریفیرای فەرەنساو چەندین شوێنی تر تیشکی خۆری بەردەکەوێت، هەروەک لە خشتەی (٥) کەتایبەتە بەتێکرای کاتژمێرە خۆراوییەکانی هەندێ هەرێمی گەشتوگوزاری لەجیهاندا بۆ مانگەکانی گەشتوگوزاری لە جیهاندا بۆ مانگەکانی (مایس – ئەیلوول). بێگومان بەرکەوتنی ناوچەی لێکۆڵینەوە بە بڕێکی باشی تیشکی خۆر بەتایبەتی لەماوەی نێوان مانگەکانی (مایس- ئەیلول)کە تێکڕای کاتژمێرە خۆراوییەکانی (١٠.٨- ١٠.٣) کاتژمێرە لەهەرێیەکە لە ویستگەی سۆران وشەقڵاوە.

خشتەی ژمارە (٥)

تێکڕای کاتژمێرە خۆراوییەکانی هەندێ هەرێمی گەشتوگوزاری و ناوچەی لێکۆڵینەوە بۆ مانگەکانی (مایس–ئەیلوول)

| هەرێمەگەشتوگوزارییەکان | ژمارەی کاتژمێرە خۆراوییەکان |
|---|---|
| کەنارەکانی تونس | ١١ |
| کەناری باشووری ئیسپانیا | ١٠.٨ |
| کەناری مەراکیش | ١٠.٤ |
| کەناری دەریای رەشی بولگاریا | ١٠.٢ |
| کەناری دەلماشیا | ١٠ |
| ریفێرای فەرەنسا | ٩.٤ |
| کەناری کەنداوی بەسکای و فینیسیا | ٨.٦ |
| سەقەلیە | ٩ |
| ئیتالیا | ٩.٤ |
| کەناری رۆژهەڵاتی ئیسپانی | ٩.٢ |
| مایۆرکا | ١٠.٤ |
| ناوچەی لێکۆڵینەوە | ١٠.٦ |

سەرچاوە : ١) ن.أنيف وزملائە ، اقتصاد وتنظيم السياحة ، فارنا ، ١٩٧٥ ، لا٨١ ، (وەرگیراوە لە: نياز عبدالعزيز خطاب ، تقيم سياحي، لمناخ اقليم جبال كوردستان العراق ، رسالة ماجستير مقدمة الى مجلس كلية الاداب ، جامعة صلاح الدين ، ١٩٩٨ ، ص٣٢).
٢) خشتەی ژمارە (٣).

ب- گونجانی تێکڕای پلەی گەرمی ناوچەی لێکۆڵینەوە کە دەگاتە (١٧.٦، ١٦.٩، ١٣.٧) لەهەرسێ وێستگەی شەقلاوە و سۆران ومێرگەسۆر هەروەک لە خشتەی (٦) دیارە، لەپاڵ نەبوونی رێژەی شێی بەرز لە وەرزی هاویندا، بەمەش هەستکردنی گەشتیار بەگەرمی زۆر کەم دەکاتەوە، لە رێگەی ئارەقەکردنەوە دەبێتە هۆی ساردبوونەوەی لەشی مرۆڤ، هەروەها بەرزی رێژەی شێ لەوەرزی زستاندا، بەمەش مرۆڤ هەست بەساردی زۆر ناکات هەروەک لە خشتەی (٧) دیارە.

خشتەی (٦)
تێکڕای مانگانەی پلەکانی گەرمی و ماوەی گەرمی
لەوێستگەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە

| مانگەکان | و. شەقلاوە | | | | و.سۆران | | | | و. مێرگەسوور | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بەرزترین | نزمترین | ماوەی گەرمی | تێکڕا | بەرزترین | نزمترین | ماوەی گەرمی | تێکڕا | بەرزترین | نزمترین | ماوەی گەرمی | تێکڕا |
| ک دووەم | ٩,٤ | ١ | ٨,٤ | ٥,٢ | ٧,٣ | ٠,٥- | ٧.٨ | ٣,٤ | ٤,٩ | ٣.٥- | ٨,٤ | ٠,٧ |
| شوبات | ١٠ | ٢ | ٨ | ٦ | ٩ | ١.٥ | ٧,٥ | ٥,٣ | ٧,٢ | ٣- | ١٠,٢ | ٢,١ |
| ئازار | ١٥,٥ | ٦ | ٩,٥ | ١٠,٨ | ١٥ | ٥,٩ | ٩,١ | ١٠.٥ | ١١ | ٢.٨ | ٨,٢ | ٦,٩ |
| نیسان | ٢٠,٣ | ٩.٤ | ١٠,٩ | ١٤,٩ | ٢٠ | ٩ | ١١ | ١٤.٥ | ١٧ | ٣,٧ | ١٣,٣ | ١٠,٤ |
| مایس | ٢٦ | ١٥ | ١١ | ٢٠,٥ | ٢٥,١ | ١٤ | ١١,١ | ١٩,٦ | ٢٠,١ | ١٠,٥ | ٩,٦ | ١٥,٣ |
| حزیران | ٣٣ | ٢٢ | ١١ | ٢٧,٥ | ٣٢,٨ | ٢١,٥ | ١١,٣ | ٢٥,٢ | ٢٥ | ١٦ | ٩ | ٢٠,٥ |
| تەمووز | ٣٧.٩ | ٢٣,٧ | ١٤.٢ | ٣٠.٨ | ٣٧ | ٢٢,٩ | ١٤,١ | ٣٠ | ٣٢,٥ | ١٨ | ١٤,٥ | ٢٥,٣ |
| ئاب | ٣٧.٤ | ٢٣,١ | ١٤,٣ | ٣٠.٣ | ٣٦,٧ | ٢٢,٦ | ١٤,١ | ٢٩,٧ | ٣٣ | ٢٠ | ١٣ | ٢٦,٥ |
| ئەیلول | ٣٤ | ١٨ | ١٦ | ٢٦ | ٣٣ | ١٦,٦ | ١٦,٤ | ٢٤,٨ | ٣٠,٧ | ١٦,٥ | ١٤,٢ | ٢٣,٦ |
| ت. یەکەم | ٢٦.٩ | ١٣.٣ | ١٣,٦ | ٢٠.١ | ٢٥,٣ | ١٢,٨ | ١٢,٥ | ١٩,١ | ٢١.٩ | ١١,٥ | ١٠.٤ | ١٦,٧ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ت.دووەم | ١٨ | ٧ | ١١ | ١٢.٥ | ١٧,١ | ٦,٨ | ١٠,٣ | ١٢ | ١٦ | ٢,٩ | ١٣,١ | ١١ |
| ک.یەکەم | ١١.٦ | ٢ | ٤,٦ | ٦.٨ | ١٠,٩ | ١,٨ | ٩,١ | ٦,٤ | ١٠ | ١.٥ | ٨,٥ | ٥,٨ |
| تێکرا | ٢٣,٣ | ١١.٩ | ١١,٤ | ١٧,٦ | ٢٢,٤ | ١١,٢ | ١١.٢ | ١٦,٩ | ١٩.١ | ٨,٣ | ١٠,٨ | ١٣,٧ |

سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشتبەستن بەوێستگەی کەشناسی سۆران، شەقڵاوە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٢)، مێرگەسۆر (٢٠١٠-٢٠١٢)

(١) حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، هۆبەی ئاماری کەشناسی، ئاماری پلەی گەرمی لە تۆماری بڵاونەکراوە.

خشتەی ژمارە (٧)

تێکرای مانگانەی شێی ڕێژەیی(%) لەوێستگەکانی دەڤەری لێکۆڵینەوە

| وێستگەکان | مانگەکان | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ک.دووەم | شوبات | ئازار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمموز | ئاب | ئەیلول | ت.یەکەم | ت.دووەم | ک.یەکەم | تێکرا |
| و.شەقڵاوە | ٦٦,١ | ٥٩,٨ | ٥٧,٦ | ٥٥,٦ | ٤٥ | ٣٤ | ٣١,٧ | ٢٨.٦ | ٣٠,٢ | ٣٩ | ٥٠,١ | ٦٢,٨ | ٤٦,٧ |
| و.سۆران | ٧٥ | ٧٤,٥ | ٦٦ | ٦٦,٩ | ٥٨,٧ | ٥٠ | ٤٨,٣ | ٤٨,١ | ٤٩ | ٦٠,٦ | ٦٨,٥ | ٧٢,٧ | ٦١,٥ |
| و.مێرگەسوور | ٨٠ | ٧٨,٥ | ٦٩ | ٦٨,٧ | ٦٠ | ٥٥ | ٥٣,١ | ٥٢,٥ | ٥٣,٦ | ٦٣ | ٦٩.٨ | ٧٨ | ٦٧,٣٥ |

سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشتبەستن بە وێستگەی کەشناسی سۆران،شەقڵاوە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٢)، مێرگەسۆر(٢٠١٠-٢٠١٢)

(١) حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، هۆبەی ئاماری کەشناسی، ئاماری شێی ڕێژەیی تۆماری بڵاونەکراوە.

پ-مام ناوەندی خێرای (با)و نەبوونی (با)ی بەهێزو بێزارکەر، نەبوونی گەردەلوولی لمی و تەپوتۆز کە تێکرای خێرایی (با) لە هەریەک لە وێستگەکانی شەقڵاوەو سۆران (٢,١، ٢,١) ئەمەش بوارێکی گونجاوە بۆ گەشتوگوزار.

خشتەی ژمارە (٨)

ناوەندی مانگانەو ساڵانەی خێرایی با(م/ چرکە) لەوێستگەکانی دەڤەری لێکۆڵینەوە

| مانگەکان | و.شەقڵاوە | و.سۆران |
|---|---|---|
| کانوونی دووەم | ٢,٩ | ١,٥ |
| شوبات | ٢.٦ | ١.٤ |
| ئازار | ٢.٥ | ٢.٣ |
| نیسان | ٢.٦ | ٢.٤ |
| مایس | ٢ | ٢.٥ |
| حوزەیران | ٢.٤ | ٢.٩ |
| تەمموز | ٢.٣ | ٢.٦ |
| ئاب | ٢.١ | ٢.٦ |
| ئەیلول | ٢ | ٢.٤ |
| تشرینی یەکەم | ١.٩ | ١.٦ |
| تشرینی دووەم | ١.٩ | ١.٥ |
| کانوونی یەکەم | ٢,٣ | ١.٣ |
| تێکرای سالانە | ٢,١ | ٢,١ |

سەرچاوە:کاری توێژەر بەپشتبەستن بە وێستگەی کەشناسی سۆران،شەقڵاوە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٢)

(١) حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو، بەرێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر، هۆبەی ئاماری کەشناسی ، ئاماری با تۆماری بڵاونەکراوە.

ت- زۆربەی بڕی بارانی باریو دەکەوێتە کەژی زستانی سارد، تێکڕای باران لەم وەرزەدا لە هەرسێ وێستگەی شەقڵاوە و سۆران و مێرگەسوور (١٤٩.٨، ١٦٣.٨، ٢٤١.٢) لم، وەرزی هاوین وەرزێکی وشکە، بارانی لێ نابارێت، هەرچی سەبارەت بەوەرزی گەشتیاری (مایس – ئەیلول) تەنها (٥,٩٨، ٩,٢، ١٦,٨) ملم لە هەرسێ وێستگەکە یەک لە دوای یەک ئەوە لە کاتێکدا ئەم ماوە ماوەی سەرەکی ئەنجامدانی چالاکی گەشتوگوزارییەکانە.

خشتەی ژمارە (٩)
کۆی گشتی بڕی بارانی باریو لە وێستگەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوە

| مانگەکان | و.شەقڵاوە | تێکرای وەرزی | و.سۆران | تێکرای وەرزی | و.مێرگەسوور | تێکرای وەرزی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کانوونی یەکەم | ١٢٢.١ | ١٤٩,٨ | ١٤٥,٢ | ١٦٣,٨ | ٢٣٥,١ | ٢٤١,٢ |
| کانوونی دووەم | ١٥١,٥ | | ١٦٠,٦ | | ٢٥٩,٦ | |
| شوبات | ١٧٥.٧ | | ١٨٥,٧ | | ٢٢٨,٩ | |
| ئادار | ١٢١,٨ | ٨٣ | ١٣٠,٤ | ٩٢,١ | ٢١١,١ | ١٣٧,٨ |
| نیسان | ١٠٣ | | ١١٠,٧ | | ١٥٦,٥ | |
| مایس | ٢٤,١ | | ٣٥,٣ | | ٤٥,٧ | |
| حوزەیران | ٠,٨ | ٠.٦ | ١,٦ | ٠.٥ | ٢ | ٠,٦ |
| تەمموز | – | | – | | – | |
| ئاب | ٠,٩ | | – | | | |
| ئەیلوول | ٤,١ | ٣٨,٤ | ٩,٢ | ٤٨,٠٣ | ٣٦,٤ | ٩١,٦ |
| تشرینی یەکەم | ٤٤,٢ | | ٥٦,٦ | | ٩٧ | |
| تشرینی دووەم | ٦٧ | | ٧٨,٣ | | ١٤١,٣ | |
| تێکرا | ٨١٥,٢ | | ٩١٣,٦ | | ١٤١٣,٦ | |

سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشتبەستن بە وێستگەی کەشناسی مێرگەسۆر "سۆران،شەقڵاوە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٢)

١ – حکومەتی هەرێمی کوردستان،وەزارەتی کشتوکاڵ و سامانی ئاو،بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی هەولێر،هۆبەی ئاماری کەشناسی،تۆماری مانگانەی بڕی باران بارین تۆماری بڵاونەکراوە.

جێی ئاماژەپێکردنە بڕی بەفری باریو لە ناوچەی لێکۆڵینەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت، بێگومان ناوچە شاخاوییە بەرزەکان بڕێکی زۆر بەفری لێدەبارێت کاتێکی زۆریش دەمێنێتەوە.

لەپێناو هەڵسەنگاندنی بایەخی گەشتوگوزاری ئاووهەوای ناوچەی لێکۆڵینەوە بەچاکی دەزانین هاوکێشەی ئاووهەوای تایبەت بەم بابەتەپراکتیک بکەین هاوکێشەکەش بریتییە لە :

**هاوکێشەی (تۆم – Thom):**

تۆم پشت بە رێبەری و گەرمی و شیی(THI) دەبەستێ، ئەم رێبەرەش بەپێوەرێکی گونجاو دەزانێ بۆ دەرخستنی هەستی مرۆڤ لە هەوای گەرمدا لە سیفەتەکانی ئەم رێبەرەش ئەوەیە کە دوو رەگەز بەکاردەهێنێ بۆ هەستکردن بەپشوو ئەوانیش بریتین لەپلەی گەرمی و شێ ئەم رێبەرەش بۆمان دەردەخات لە کاتی زیادبوونی شێ مرۆڤ هەست بەگەرمایەکی زیاتر دەکات لەپلەی گەرمی تۆمارکراو ئەوەش بەهۆی تێربوونی هەوا بە شێ کە لەئەنجامدا بەهەڵمبوون لە لەشی مرۆڤدا رادەوەستێ[٢٧].

تۆم چەند کاتێکی بۆ ئاستی هەستکردنی مرۆڤ بە ئارامی و جۆری ئاووهەوای گەشتوگوزاری داناوە وەک لە(خشتەی ١٠) دەردەکەوێت.

$$THI\ (Di) = t - 0.55\ (1-h)(t - 14.5)$$

بە جۆرێک:

(THI (Di = پارسەنگی بێزاری

t = پلەی گەرمی بە (س$^{o}$)

h = رێژەی شێ

خشتەی ژمارە (١٠)

بەهاو جۆری ئارامی (پشوو) بۆ ئاووهەوای گەشتوگوزاری لە هاوکێشەی (تۆم)دا

| بەهای (THI (Di | جۆری ئارامی (پشوو) |
|---|---|
| کەمتر لە ١٠ | زۆر بێزارکەر |
| ١٠ – ١٥ | بێزارییەکی مامناوەند |
| ١٥ – ١٨ | نیمچە ئارامی |

| | |
|---|---|
| ١٨ – ٢١ | ئەوپەڕی ئارامی (ئارامی تەواو) |
| ٢١ – ٢٤ | نیمچە ئارامی |
| ٢٤ – ٢٧ | بێزاری مامناوەند |
| ٢٧ – ٢٩ | زۆر بێزارکەر |
| ٢٩ و زیاتر | نەمانی ئارامی و بوونی ترس بۆسەر ژیان |

سەرچاوە / علي حسن موسى، المناخ والسياحة، دار الأنوار، الطبعة الأولى، دمشق، ١٩٩٧، ص٦٨-٦٩.

بەپراکتیککردنی هاوکێشەی تۆم کە ڕێبەری گەرمی و شێ نیشاندەدات بەسەر ناوچەی لێکۆڵینەوە وەک لە (خشتەی١١) هاتووە بۆمان دەردەکەوێت کە:

١- تێکرای ئەو مانگانەی دەرەنجامەکانیان نزیکە لەگاپی(١٥ – ٢٤) دەگاتە نزیکەی (٦) مانگ لە وێستگەی شەقڵاوە و (٥) مانگە لە وێستگەی سۆران و(٦)مانگە لە وێستگەی مێرگەسوور.

٢- کۆی ئەو مانگانەی کە ئەوپەڕی پشوو بۆ سەرجەمی خەڵک (١٠٠%) دەرەخسێنن لە وێستگەی شەقڵاوە دەگاتە نزیکەی (٢) مانگ وە لەوێستگەی سۆران (٢) مانگ وەلە وێستگەی مێرگەسوور (٢) مانگە لەبەر ئەوەی دەرەنجامەکانیان نزیکە لەگاپی(١٨ – ٢١).

٣- سەرجەمی ئەو مانگانەی کە زۆر بێزارکەرن لە رووی گەشتوگوزارییەوە لە هەردوو وێستگەی شەقڵاوەو سۆران (٣) مانگە، هەرچی وێستگەی مێرگەسوورە(٤)لەبەرئەوەی دەرەنجامەکانیان کەمترە لە(١٠) و زیاترە لە(٢٧).

٤- تێکرای ئەو مانگانەی بۆ کەمترە لە نیوەی خەڵک (١٠ – ٥٠ %)گونجاون (٩) مانگە لەهەردوو وێستگەی شەقڵاوە و سۆران، هەرچی وێستگەی مێرگەسوورە (٨) مانگە، لەبەرئەوەی بەهای (THI) نزیکە لەگاپی (١٠ – ٢٦).

خشتەی ژمارە (١١)
تێکڕای بەهای (THI)، پارسەنگی پشوو،
لە هەرسێ وێستگەی شەقڵاوەو سۆران ومێرگەسوور

| بەهای THI ی وێستگە | مانگەکان | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کانوونی دووەم | شوبات | ئازار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەموز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم |
| و. شەقڵاوە | ٦,٩ | ٧,٩ | ١١,٧ | ١٤,٨ | ١٨,٧ | ٢٢,٨ | ٢٤,٧ | ٢٤,١ | ٢٢,١ | ١٨,٢ | ١٣,٠٤ | ٨,٤ |
| و. سۆران | ٤,٩ | ٦,٦ | ١١,٢ | ١٤,٥ | ١٨,٤ | ٢٣,٧ | ٢٥,٦ | ٢٥,٤ | ٢١,٩ | ١٨,١ | ١٢,٤ | ٨,١ |
| و.مێرگەسوور | ٢,٢ | ٣,٦ | ٨,٢ | ١١,١ | ١٥,١ | ١٩,٠١ | ٢٢,٥ | ٢٣,٤ | ٢١,٣ | ١٦,٣ | ١١,٦ | ٦,٩ |

سەرچاوە / کاری توێژەر بەپشتبەستن  بە خشتەکانی ژمارە (٦) و (٧)

٥- تێکرای گشتی ساڵانەی ئاوی ئەم زێیە بەرزە دەگاتە (١٣.٨٣ملیارم$^{٣}$)، هەروەها تێکڕای گشتی لەبەرڕۆیشتنی ئاوەکە دەگاتە (٢٢٤م$^{٣}$ /چرکە)[٢٨]. هەرچی جۆری ئاوەکەو سیفاتە کیمیاییەکانی بۆ هەموو جۆرە کارێکی رۆژانەی ناو ماڵ و دابینکردنی پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی گەشتیار گونجاوە، بەڵام تەنها بۆ خواردنەوە بەکارنایەت چونکە پێویستی بەچەند پرۆسەیەک هەیە تا بۆ خواردنەوە بگونجێت. هەموو ئەم تایبەتمەندییانە وچەندانی تر بەڵام، تاوەکو ئەمرۆ نەتواندراوە بەگوێرەی پێویست سوود لەم ئاوە وەربگیرێت، لەکاتێکدا بوونی ئەم تایبەتمەندییانە زەمینەسازن بۆ ئەنجامدانی چەندین چالاکی گەشتوگوزاری و گەشەپێدانی گەشتوگوزار لەم ناوچەیە، بە جۆرێک بتواندرێت پێداویستییەکانی گەشتیارانی هەرێمی کوردستان دابین بکات، دەکرێت چەندین هاوینەهەوارو گازینۆو چێشتخانەی گەشتیاری دروست بکرێت بۆ دابینکردن و پڕکردنەوەی پێداویستی گەشتیاران.ئەم چەمە لەگەڵ ئەوەی لەڕووی گەشتوگوزارییەوە، هیچ جۆرە خزمەتگوزارییەکی بۆ نەکراوە. بەڵام زێی گەورە یەکێکە لە

توانستە گەشتوگوزارییەگرنگەکانی هەرێمی چیای پارێزگای هەولێر،چونکە کۆمەڵێک فاکتەری گەشتوگوزار لەخۆوە دەگرێت لە ئاووهەوای فێنک و دیمەنی سروشتی سەرنجراکیش و چڕی پۆشاکی رووەکی ودەوڵەمەندی بە ئاژەڵ و باڵندەی کێوی شان بە شانی توانستە مرۆییەکان.

پشتبەستن بەم بنەمایانەی لە زێی گەورە بوونیان هەیە، لە ئێستا وداهاتوودا دەتواندرێت بۆچەندین جۆر لەچالاکی گەشتوگوزاری بەکاربهێنرێت کە بۆ پێشکەوتن و گەشەپێدانی چەندین کار ئەنجام بدرێت :

**٥-٢: گەشتوگوزاری خێوەتگا (چادرگە)**

لە رۆژگاری ئەمرۆدا گەشتوگوزاری چادرگەکان لەپەرەسەندنی بەردەوامدایە بەهۆی زۆری ژمارەی گەشتیاران وکەمی تێچوون و ئاسانی دامەزراندن، ئەم جۆرەگەشتوگوزارە لەچەندین وڵاتە گەشتوگوزارە پێشکەوتووەکان بەدی دەکرێت لەوانە خێوەتگای (بلافاند هافیدیجیرغ) کە دەکەوێتە سەرکەناری هایفیدیجیرغ لە دانیمارک کەچەندین چالاکی جۆربەجۆری تێدایە، هەروەها خێوەتگای (مبنیغ سانغولی) کە دەکەوێتە شاری سالو ئیسپانی، کە بەیەکێک لە خیوەتگا بەناوبانگەکان دادەندرێت جگە لەمانە خیوەتگای (کارافان پارک سیکستین) لە ئیتالیا[٢٩]، لەچەندین شوێنی تریش بەدی دەکرێت.

١-بوونی رووبەرێکی پێویست لەچەندین شوێنی زێی گەورە کە دەتواندرێت خێوەتگایان لێدابمەزرێت لە وانە :

أ- لەدەوری چەمی رێزان کەرێژگەیەکە لە رێژگەکانی زێی گەورە کە شوێنێکی گونجاوە بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە بە هۆی بوونی رووبەرێکی فراوان و تەختایی لە کەناری چەمەکە بە تایبەتی لە لای دۆڵی زرار وێنەی(١٣).

وێنەی (١٣) دۆڵی زرار



ب- لەلای دۆڵی زورگڤان کە دەکەوێتە بەری رۆژئاوای زێی گەورە و دامێنی چیای پێرس ئەم ناوچەیە دەوڵەمەندە بە سەوزایی ودارو درەختێکی زۆر لەوانە داری قەزوان، گوێز و هەرمێ وچەندین جۆری تریش، جگە لەمەش رووبەرێکی گونجاوی هەیە لەپاڵ دەوڵەمەندی ئەم ناوچەیە بەچەندین چەم وتاڤگە.

پ- گونجانی کەنارەکانی زێی گەورە لە لای ناحیەی هەریر لەلای گوندەکانی مەکردان و بەردینی خواروو قورەبەگ گەربێت و خزمەتگوزارییەکانی بۆ دابین بکرێت ناوچەیەکی گونجاوە بۆ بەکارهێنانی ئەم ناوچەیە بۆ ئەم جۆرە چالاکییە.

ت- لەدەوری چەمی چۆمان لەلای دۆڵی (گەلی) وسەکران ئەم شوێنەش رووبەرێکی باشی هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە چالاکییە.

٢- هەوڵدان بۆ دروستکردنی چەندین پرۆژە بۆ دابەشکردنی کارەباو راکێشانی ئاو بۆ خێوەتگەکان، کە دەتواندرێت لە رێگای بەکارهێنانی لولەی ئاو لە زێی گەورە رابکێشرێت بۆ دابینکردنی پێداویستی گەشتیار.

٣- بوونی رێگاوبانی لەسەرناوچەی لێکۆڵینەوە لەوانە لەلای رێزان بوونی رێگای هاتوچۆ کە بە هۆی پردی زرار-بێخشاش گوندەکان بە دۆڵی زرار و سەنتەری ناحیەی مێرگەسوور دەگات. هەرچی لەلای دۆڵی زورگڤانە رێگایەکی قیرتاوکراو هەیە بۆ ئەم ناوچەیە ئەمەش بایەخی گەشتوگوزاری

ناوچەکە زیاد دەکات، هەرچی سەبارەت بەلای ناحیەی هەریرە لەو شوێنەش چەندین ڕێگای نوێ دروست کراوە، لەوانە نۆژەنکردنەوەی پردی قەندیل، هەرچی بۆ دۆڵی سەکرانیشە بەر لەوەی بگەینە شارۆچکەی چۆمان لە نزیک گوندی ناوپردان، ڕێگایەکی قیرتاوکراو هەیە بۆ دۆڵی سەکران و گوندەکان دەڕوات.

٤- چاندنی داروردەخت لەم شوێنانەی کەپێویستییان پێیە بەتایبەتی لەلای هەریر، چونکە ئەم ناوچە تەختاییە گەرمە بۆیە پێویستە بە درێژایی کەنار لەو بەشەی زێی گەورە بکرێتە دارستانێکی ڕێکوپێک بە مەبەستی جوانکردنی شوێنەکە و ئەمە لەلایەک لەلایەکی تر بەمەبەستی کەمکردنەوەی کاریگەری تیشکی خۆر و پلەی گەرمی لە سەر گەشتیاران.

٥- هەوڵ بدرێت چادرگەکان لە سەر شێوازی ئەندازەی جوان وسەرنجڕاکێش و ئارامگیر (مریح) دروست بکرێت بۆ ئەوەی گەشتیاران بۆلای خۆی رابکێشێت.

٦- گرنگیدان بە ڕێکخستنی کەناری زێیەکە بە تایبەتی لەو بەشانەی کە تیشکمان خستە سەری بەمەبەستی دروستکردنی مەلەوانگە، بۆ ئەنجامدانی چالاکییەگەشتوگوزارییە جۆربەجۆرە ئاوییەکان وەک (راوکردن،گەڕان بەماتۆڕسازی، خلیسکان لەسەر ئاو،پێشبڕکێی ئاوی)چێژوەرگرتن لە توانستەکانی ئەم ناوچەیە. بۆ نموونە دەتواندرێت لەلای چەمی ڕێزان و دۆڵی زورگڤان لەلای دۆڵی زرار دوو شوێنی زۆر گونجاوە بۆ ئەوەی مەلەوانگەی تێدا ئەنجام بدرێت، لەپاڵ خلیسکان لەسەر ئاو گەڕان بە ماتۆڕسازی لە نێویدا هەروەها بە هۆی دەوڵەمەندی ئەم ناوچانە بە داروردەخت وای لێ کردووە دەوڵەمەند بن بە ئاژەڵ و باڵندەی کێوی، ئەمەش هۆکارێکە بۆ ئەنجامدانی راوکردنی سنووردار لەم شوێنانە، هەروەها بوونی کانی تەندروستی وەک کانی زەرک لەگوندی بلێ لە نێو دۆڵی زورگڤان کە بۆچارەسەرکردنی نەخۆشی زەرتک سوودی لێ وەردەگیرێت، هەروەها کانی باڵەکایەتی کە دەرمانە بۆچارەسەرکردنی نەهێشتنی بەردی گورچیلە بۆیە پێویستە هەوڵ بدرێت لەدەوری ئەم کانییە مەلەوانگەیان حەوز دروست

بکرێت لەشێوەی داخراو کراوە بن بە قووڵایی جیاواز بن، هەروەها پێویستە (W.C) شۆرگە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بۆ دروست بکرێت لەپاڵ دروستکردنی شوێنی پشوودان و کات بەسەر بردنیش بۆ ئەو کەسانەی مەلە ناکەن وەک بوونی گازینۆو چێشتخانە و ئەمەو چەندەها بیرۆکەی تر کەپێویستە لەلایەن ئەندازیاران کاری لەسەر بکرێت.هەروەها هەوڵ بدرێت لەم شوێنانە سەنتەری مەساج وشێلان (چارەسەری سروشتی) دابندرێت بۆ ئەوەی سەرنجی زیاتری گەشتیار بۆ خۆی رابکێشێت. لەپاڵ بوونی یاریگا بۆچینی منداڵ و گەنجان.

٧- بەهۆی نزیکی ناوچەکان لە ناوچە شاخاوییەکان دەکرێت چەندین چالاکی تری گەشتیاری تری تێدا ئەنجام بدرێت وەکو هەڵگەڕان بەسەر چیاکان، خۆفڕێدان لە بەرزاییەکان بەپەڕەشووت لەوانە وەکو بوونی چیای شرین و سەکو لەلای چەمی رێزان، چیای پێرس لەلای دۆڵی زورگڤان، هەروەها بوونی چیای سەکرانیش لەلای دۆڵی سەکران ئەوەی شایەنی باسە ئەم چیایە لە مانگی تەمووزیش بەفری زستان لەسەر بەرزاییەکانی دەمێنێتەوە، بۆیە دەتواندرێت کاری لەسەر بکریت بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە چالاکییانە.

جگە لەمەش لە قەد پاڵی چیاکانی دۆڵی زورگڤان چەندین ئەشکەوت لەخۆ دەگرێت وەکو ئەشکەوتی شانەدەرو چەندین ئەشکەوتی تریش، هەروەک دەزانین ئەشکەوتی شانەدەر یەکێکە لە ئەشکەوتە بەناوبانگەکانی هەرێمی کوردستان و جیهان لەبەرئەوەی جێنشینبوونی مرۆڤ بووە لە کۆنەوە ئەمەش بۆتە هۆکارێک بۆ ئەوەی سەرنجی گەشتیاران بۆ خۆی رابکێشێت.

**٥-٣: گەشتوگوزاری حەوانەوەو خۆش گوزەرانی**

١- بەهۆی فراوانی رووبەری حەوزی زێی گەورە لە ناوچەی هەرێمی چیای پارێزگای هەولێر هۆکارێکی یارمەتیدەرە بۆ دامەزراندنی خزمەتگوزاری سەرخانی ئابووری و ژێرخانی ئابووری لە چەندین شوێنی

جیاوازی زێیەکە لەگەڵ بەکارهێنانی کەرەستەی سروشتی ناوچەکە لە دروستکردنیدا بۆپاراستنی ژینگەی ناوچەکە لە تێکدان.

٢- دروستکردنی (بەنداو) بەست لەچەند شوێنێکی زێی گەورە لەوانە دەتواندرێت چەند بەست و بەنداوی بچووک وناوەند لەسەر چەمی شەمدینان و رەواندزو باڵەکایەتی و رێزان دروست بکرێت، بوونی ئەم بەست وبەنداوانە بۆ هەردوو مەبەستی گەشتوگوزارو وەبەرهەمهێنانی کارەبا لەچەند روویەکەوە سوودی لێوەردەگیرێت وەک:

ا- هەوڵدان بۆ جوانکردنی سروشتی ناوچەکە لە میانەی دروستکردن و رێکخستنی شوێنی دانیشتن و کەپر لە نزیک بەنداوی رێزان، بێخمە بۆحەوانەوەو پشوودانی گەشتیاران و لەپاڵ دانانی یاری و یاریگای جۆراو جۆر بۆچینی مێردمنداڵان و گەنجان و خێزان.

ب- بەکارهێنانی ئەم بەستانە بۆ چەندین چالاکیگەشتوگوزاری لەوانە بەکارهێنانی چەمی باڵەکایەتی (چۆمان) لەپێشبرکێی ئاوی بەهۆی ئەوەی ئاوەکە لەو ناوچەیە خێراییەکەی گونجاوە بۆ ئەم جۆرەچالاکییە.ئەم بەستانە لەلای چەمی رێزان و زێی گەورەیە (لەلای ناحیەی هەریر) دەتواندرێت بە مەبەستی راوکردنی ماسی و مەلەکردن و خلیسکان لەسەر ئاو چەندین یاری تریش.

پ- چاندنی دارودرەخت بە دەوری بەنداوەکە کە دەبێتە هۆی جوانکردنی سروشتی ناوچەکە، ئەمە لە لایەک لە لایەکی تر گەشتیاران دەپارێزێت لە پلەی گەرمیی بەرز لە وەرزی هاویندا.

ت- بەکارهێنانی ئەم بەستانە بۆ بەدەستهێنانی وزەی کارەبا بەتایبەتی لەسەر چەمی شەمدینان وبێخمەو رێزان لەبەرئەوەی خێرایی ئاوەکەی زۆرە لەم ناوچەیەدا.

ج- دروستکردنی پارک بۆ وەستانی ئوتۆمبیل لەپاڵ دابینکردنی ئاوی خواردنەوەو ئاوەرۆ لەگەڵ دانانی گشت پێداویستییەکانی گەشتیاری.

٣- ناوچەی هەڵبژێردراو، بۆ دامەزراندنی گەشتوگوزاری خۆشگوزەرانی و حەوانەوە چەندین توانستی تێدایە لەوانە بوونی هەندێ

دوورگەی بچووک لەچەند شوێنی زێی بچووک وەک لەلای هەریر و لای مێرگەسوور هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی ئەم دوورگانە پاش ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی ورد لەسەر پێکهاتەکەی لەلایەن پسپۆرانی وزانینی رادەی سەلامەتی کە ئایا تا چەند گونجاوە بۆ دروستکردنی گازینۆ و پارکی بچووک هەروەک ئەو دوورگانەی لەلایگوندی (تانکە، هەربۆ، مەکردان، قورەبەگ) وێنەی (١٤)



وێنەی (١٤)هەندێ دوورگە لە نێو زێی گەورە



٤- گرنگی دان بەسیفات وپاکی و جوانی ناوچەکە، هەروەها ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی سالانە لە ناوچە جیاوازەکانی زێی گەورە لەگەڵ رێکخستنی کاری ریکلام و بانگەواز پەنابردنە بەر سەرمایەداران (ناوەخۆ ودەرەکی) لەئامادەکردنی پرۆژەکان، وەک دروستکردنی ئۆتێل و کابینەی گەشتیاری و چێشخانەو چەندین پرۆژەی تر.

### ٦- پێنجەم: دەرئەنجام وراسپاردە

### ٦-١: دەرئەنجام

گرنگترین دەرئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە بریتین لە :

١- گەشتوگوزار یەکێکە لە دیاردە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمەو بنەمای ئابووری چەندین دەوڵەتە بە ئەوەی بەشداری دەکات لە دابینکرنی هەلی کارکردن ونەهێشتنی بێکاری لەپاڵ دابینکردنی داهاتی نیشتمانی.

٢- گەشەپێدانی گەشتوگوزاری ئەو پرۆسەیە پەیڕەوی هاوچەرخترین تەکنیک و تەکنەلۆژیا دەکات بەمەبەستی سوود وەرگرتن لەم دەرامەتە گەشتوگوزارییانەی کە بەدی دەکرێت، جگە لەمەش گەشەپێدانی گەشتوگوزاری هەوڵ دەدات گۆڕانێکی ریشەیی لەهەموو توخمەکانی گەشتوگوزار بێنەکایەوە لەپێناو بەکارهێنانی نموونە بۆ توخمەکانی گەشتوگوزار.

٣- سامانی ئاوی پەیوەندی راستەوخۆی لەسەر پەیدابوون و گەشەسەندنی چالاکی گەشتوگوزاری هەیە، لەبەرئەوەی زۆربەی چالاکییەگەشتوگوزارییەکان بە دەرامەتی ئاوەوە بەستراوەتەوە، لەم بارەیەوە ناوچەی لێکۆڵینەوە دەوڵەمەندە بە سامانی ئاوی بەتایبەتی ئاوی سەرزەوی بریتییە لە زێی گەورەو چەمی شەمدینان و رەواندز و ماوەران وچەندین چەمی تریش، کە ئەمیش دەتواندرێت لەچەندین بواری جۆراوجۆری گەشتوگوزاری بەکاربێت وەک راوە ماسی و یارییەکانی نێو ئاو وگەران بەماتۆرسازی و مەلەکردن وچەندین چالاکی تر بەکاربێت.

٤- زێی گەورە بە توانستێکی بایەخدار هەژمار دەکرێت بۆگەشەپێدانی گەشتوگوزاری لەبەر ئەوەی سەرچاوەکانی ئاوی ئەم زێیە مۆڵگەی جۆرەها ماسی و بوونەوەری تری ئاوین. جگە لەمەش فاکتەرێکی سەرەکییە بۆ بوونی دارستان وگژوگیای هەمەچەشن بەدرێژایی رێرەوە ئاوییەکان. لەپاڵبوونی تاڤگە ودیمەنی دڵڕفێن و سەرنجراکێش کە دیارترینیان کانیاوی (بێخاڵ، حاجی عەباس)ن.

٥- لە ماوەی لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت کە، کەرستەی خاوی گەشەپێدانی گەشتوگوزار لە زێی گەورە بەشێوەیەکە لە رێگەیەوە بتوانرێت چەندین جۆری جیاواز لە گەشتوگوزاری حەوانەوە و خۆش گوزەرانی و خێوەتگا لەچەندین شوێنی جیاوازدا دروست بکرێت ببێتە مەڵبەندی سەرەکی راکێشانی گەشتیاران.

**٧-راسپاردە**

لێکۆڵینەوەکە چەند راسپاردە و پێشنیازێک دەخاتەروو:

**١-** دامەزراندنی لێژنەیەکی پسپۆڕ و شارەزا بۆ فراوانکردن وپێشخستنی ناوچەگەشتوگوزارییەکان لەگەڵ دەسنیشانکردنی ئەو شوێنانەی کە لە داهاتوودا سوودیان لێوەردەگیرێت بۆ مەبەستی گەشتوگوزار.

**٢-** دروستکردنی دەستەیەکی لێکۆڵینەوە و پەرەپێدانی ئاوە کانزاییەکانی ناوچەی لێکۆڵینەوەلەرووی گەشتوگوزارو چارەسەرەوە بە شێوەیەکی پێشکەوتوو تا گەشتیاران بۆچارەسەری نەخۆشی رووی تێ بکەن.

**٣-** هەوڵدان بۆ زیادکردنی رووبەری سەوزایی لە میانەی چاندنی دارو درەختی کە پێویستە بۆ نوێکردنەوەی ناوەندە گەشتیارییەکان و جێگرتنەوەی دارە بڕاوو لەناوچووەکان، بەتایبەتی لەکەناری زێ و چەمەکان بۆ سەرنجڕاکێشانی گەشتیاران.

٤-سەرچاوە ئاوییەکان بە زێ و چەم وجۆگەو کانیاوەکان بپارێزرێن و خزمەتگوزاری گەشتیاری لە نزیکیانەوە دابمەزرێت، بۆ جێبەجێکردنی داواکاری گەشتیاران.

**پەراوێز و لیستی سەرچاوە:**

١- آزاد محمد امين، المقومات الجغرافية الطبيعية لنشوء وتطور السياحيةفي المنطقة الجبلية في العراق، مقدمة في الجغرافية السياحة (مع دراسة تطبيقية عن قطر العراق)، بلاطبعة، ١٩٨٠، ص٨٩.

٢- هدى صباح نجم الدين،هەڵسەنگاندنی بنەما جوگرافییەکانی گەشەپێدانی گەشتوگوزاری لە قەزای شەقڵاوە، پێشکەشی ئەنجومەنی کۆلێژی ئەدەبیات کراوە لە زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر،٢٠١٢، ل١٣.

٣- حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان، بەڕێوەبەرایەتی زانیاری و نەخشەسازی، بەشی نەخشە، هۆبەی GIS، ٢٠١٣.

٤- نالی جەواد حەمەد، خەسڵەتە سروشتییەکانی هەرێمی چیاکان لەپارێزگای هەولێر و گیروگرفتەژینگەییەکان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٨، ل٢٩.

٥- حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان، دەستەی ئاماری هەرێم، بەڕێوەبەرایەتی ئاماری پارێزگای هەولێر، هۆبەی ئاماری دانیشتوان وهێزی کار،ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر بەپێی پرۆسەی گەمارۆسازی ژمارە ریزکردنی ساڵی ٢٠٠٩، ئاماری بڵاونەکراوە.

٦- صفوح الخير، التنمية والتخطيط الاقليمي، مطابع وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٠، ص١٤.

٧- ا- مصطفى يوسف كافي، صناعة السياحة كأحد الخيارات الاستراتيجية للتنمية الاقتصادية، دار الفرات، نينار للنشر والتوزيع، ٢٠٠٦،ص١٠٦ .

ب - حسين كافي، رؤية عصرية للتنمية السياحة، النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٨٧، ص٣٧.

٨- وفاء زكي ابراهيم، دراسة تقويمية للقرى السياحية، المكتب الجامعي الحديث، الاسكندرية، ٢٠٠٦، ص٣٤.

٩- احمد فوزي ملوخية، التنمية السياحية، دار الفكر الجامعي، الاسكندرية، ٢٠٠٦، ص٤٥.

١٠- نشوى فؤاد، التنمية السياحية، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية،٢٠٠٨، ص ١٠-١١.

١١- نصرت مردان على،الواقع السياحي لمنطقة الحكم الذاتي وافاق تطويرها في فترة ما بعد الحرب العالمية، ابحاث مجلة جامعة صلاح الدين للعلوم الانسانية، العدد الثاني والثالث السنة الثانية، اربيل، ١٩٩٠، ص ٤٧١.

١٢- ئـازاد نەقشـبەندی، بایـەخی گەشـتوگوزاری سـامانی ئـاوی کوردسـتانی عیراق،گۆڤاری سـەنتەری برایەتی،چاپخانـەی وەزارەتـی پـەروەردە،ژمارە ١٣، ساڵی سێیەم، ١٩٩٩، لا٦-٧.
١٣- دارا اليعقوبي، دراسـة عـن السـياحة والتسـهيلات السـياحية فـي شـمال العـراق، رسالة ماجستير، كلية الهندسة المعمارية، جامعة بغداد، ٢٠٠٠، جدول رقم ٤-٦، ص٢٠٣.
١٤- ازاد محمد امين النقشبندي، التنمية السياحية واثرها على صيانه البيئة الطبيعية، المؤتمر العربي الثالثلادارة البيئة، شرم شيخ، جمهورية مصرية العربية، ٢٣-٢٥ نوفمبر، ٢٠٠٤،ص٨٦-٨٧ .
١٥- هاشم ياسين حمدامين،اطلس المواد الطبيعية لمحافظة اربيل وادارة الارض فيها للاغـراض الزراعيـة، رسـالة كليـة الاداب، جامعـة صـلاح الـدين، اربيـل، ٢٠٠٠، ص١٢٥.
١٦- رزگـار محمـد عوسـمان هـەنارەیی، توانسـتە جوگرافییـەکانی دروسـتکردنی پـارێزراوە سروشـتییەکان لـە هـەرێمی چیـای پارێزگـای هـەولێر گرنگییـان لـە بەدیهێنانی گەشـەپێدانی بـەردەوام، پێشکەشـی ئەنجوومـەنی کۆلێژی ئـەدەبیات کراوە، زانکۆی سەلاحەدین،٢٠١١، لا٧٩.
١٧- اسـماعيل اسـعد اسماعيل،خصـائص تصـاريف لنهـر الـزاب الكبيـر فـي اقلـيم كوردسـتان العراق، رسـالة ماجسـتير، كليـة الاداب، جامعـة صـلاحالدين، اربيـل، ٢٠٠٦، ص١٤.
١٨- نـزار ياسـين محمـد، حـوض نهـر ريـزان واسـتخداماته المائيـة (دراسـة هايدرومورفومترية)، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، اربيل ،٢٠٠٦، ص١٤-١٥.
١٩- هەڵبەسـت عبـدالرحمن توفيـق، توانسـتە جوگرافییـەکانی گەشـەپێدانی چـالاکی گەشتوگوزاری لە قەزای میرگەسۆر، پێشکەشی ئەنجومەنی کۆلێژی ئـەدەبیات کراوە لە زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر،٢٠١٢، لا٤٦.
٢٠- تحسين عبدالرحيم عزيز، هايدرومورفومترية حوض نهر رواندز واحتياجاته المائية، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، اربيل، ٢٠٠٢، ص١٨.
٢١- حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان، بەرێوەبەرایەتی زانیاری و نەخشەسازی، سەرچاوەی پێشوو.

٢٢- ا- قادر باوەجان، گەشتوگوزار"گەشتێکی مەیدانییە بەچیاکانی کوردستان "، بەرگی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٩، لا٢١-٢٧.
ب- نادر رۆستی، گەشتێک بۆ گەشتوگوزار، چاپخانەی روکسانا، چاپی یەکەم، هەولێر، لا١٥٦-١٥٧.

٢٣- رزگار محمد عوسمان هەنارەیی، توانستە جوگرافییەکانی دروستکردنی پارێزراوە سروشتییەکان لە هەرێمی چیای پارێزگای هەولێر گرنگییان لە بەدیهێنانی گەشەپێدانی بەردەوام، پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات کراوە، زانکۆی سەلاحەدین،٢٠١١، لا٦٣.

٢٤- وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن، بەرێوەبەرایەتی گشتی رێگاوبان و ئاوەدانکردنەوە نیشتەجێکردنی هەولێر، بەرێوەبەرایەتی چاککردنەوەو پاراستنی رێگاوبانی هەولێر، بەشی پلاندانان، زانیاری رێگا سەرەکیەکانی پارێزگای هەولێر، بەکۆمپیوتەر چاپکراوە، ٢٠١٠، بلاونەکراوە.

٢٥- وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن، بەرێوەبەرایەتی گشتی رێگاوبان و ئاوەدانکردنەوە نیشتەجێکردنی هەولێر، سەرچاوەی پێشوو.

26- Nature Iraq organization , "Key Biodiversity Survey of Kurdistan Northern Iraq", Nature Iraq Report , Sulaimani , 2009 ,op.cit.pp82-84.

27- JOHNE –E. OLIVER , CLIMATE AND MANS ENVIRONMENT. AN INTRODUCTION TO APPLIED CLIMATOLOGY , JOHN WILEY& SONS , INC. , NEWYORK , 1972,P200.

٢٨- هاشم یاسین محمد امین الحداد، اطلس الموارد الطبیعیة لمحافظة اربیل وادراة الاراضي فیها للاغراض الزراعیة –دراسة كارتوغرافیة-جغرافیة، رسالة ماجستیر، كلیة الاداب، جامعة صلاح الدین، اربیل، ص١٢٥.

29 -www.anazahr.com.Leisure Ltoursmlphoto-

**ملخص البحث**

تهدف هذه الدراسة الى التنمية السياحية المائية في اقليم الجبال بمحافظة اربيل واختيار نهر الزاب الكبير كنموذج، لما يتمتع به هذا النهر من اهمية من الناحية الاقتصادية منها السياحية. تأتي اهمية البحث من ان التنمية السياحية تعتبر من الحاجات الاساسية والمهمة لكونها تؤدي الى الانتعاش الاقتصادي للدولة، وتساهم في رفع المستوى المعاشي من خلال تقليل البطالة، ومعالجة المشاكل الاجتماعية الناجمة عن البطالة من خلال توفير فرص العمل.

لاشک ان تحديد الخصائص السياحية لمنطقة الدراسة تساعد على وضع الخطط الناجحة للتنمية السياحية وتطوير مقوماتها، بشكل عام ومقومات الثروة المائية بشكل خاص.

## Abstract

**Tourism development of surface water in Erbil governorate Mountainous area**

**(The Greater Zab as the sample)**

The study aims at developing Mountainous areas tourism in Erbil governorate, Erbil mountainous areas and the Greater Zab have been selected as samples of the study . The significance of the study lies in that tourism constitutes a vital sector ,for its role in economy , raising living standard, eradication of unemployment, increasing job opportunities, and social and cultural development. So, tourism contributes to all these aspects. No doubt, identifying touristic characteristics will assist in setting up a successful development plan for developing tourist potentials in general and developing naval or marine wealth in mountainous areas in particular

